




# باشترین دیاری بۆ کوردەواری

ئەم نامە یە دوو بەشە




بە نیووسی ✤
محمد شیخ طه بالیسانی

١٤٠٤ ك ـ ١٩٨٤ ز
بە یارمەتی ئەمینداریەتی گشتی ڕۆشەنبیری و لاوان چاپ کرا

# باشترین دیاری بۆ کوردەواری

ئەم نامەیە دوو بەشە ...

بەشی یەکەم ( باشترین پەند چەند دەرسێك لە تەفسیری سورەتی الحمد ) .

بەشی دووەم ( وانەی کورد زوبان بۆ تەجویدی قورئان ) .

بەنووسی
محمد شیخ طه بالیسانی

١٤٠٤ﮪ - ١٩٨٤ز

بە یارمەتی ئەمینداریەتی گشتی ڕۆشەنبیری و لاوان چاپ کرا

مطبعة شفيق - بغداد تلفون ٤١٦٨٨٣٢

## « بە ناوی خودای بەخشندەو میهرەبان »

سوپاسێکی زۆرو بێ پایان بۆ خودای گەورە کە تاکو پاکو تەنیاو بێ هەمتایە ٠

دروودو چاکە بڕژێن بە سەر گەورەی هەموو بوونەوەرێك کە حەزرەتی ( محمـد )ە و ڕابەری خوایە ٠وە لە سەر هەموو کەسو کاریو گشت دۆستو یاری ٠ وە هەر کەسێ کە بەپەیرەوی ڕێگەو ڕەووشتو ئایینی ئەم زاتە ئەکات ، تا ڕۆژی ڕەستاخێزو حیساب ٠

لە دوای ئەمە : لە کاتی خۆیدا چەند دەرسێکم لە تەفسیری سوورەتی فاتیحە لە ووتاری ڕۆژی هەینیدا بۆ موسولمانان گوتن ٠ جا لە بەر ئەوەی ئەم دەرسانەم زۆر بەسوود زانین ، ویستم بیان کەم بە نامەیەك ، بەڵکە موسولمانان سوودی لێ وەرئەگرن ٠ وە خوداش لە ڕۆژی سزادا پاداشم ئەدات بە چاکەی خۆی گوناهی زۆرم ئەبەخشیت ٠ چونکو بەس ئەوە پەنای هەژارانو چاو پۆش لە گوناهباران ٠ جا وا بە یارمەتی خوا دەست پێ ئەکەم ٠

وە ناوم نا : باشترین پەند لە تەفسیری سورەتی ( ألحمد ) ٠

وە من محمد شێخ طاها بالیسانیم ، خوا لە گوناهمان ببوریت ٠

١٤٠٣ ك      ١٩٨٣ ز

## ( پێشەکی )

هەموو موسولمانێك هەموو ڕۆژ بە لای کەمیەوە سوڕەتی ( ألحمد ) واتە سوڕەتی فاتیحە · حەقدە جار لە نوێژدا ئەخوێنی · ئەمە ئەگەر نوێژی سوننەت نەکاتن ، بەڵام ئەگەر نوێژی سوننەت بکا زیاتر ئەخوێنی ·

وەشتێکی ئاشکرایە کە نوێژ پەنا بردنە وەبار خواو پاڕانەوەیە لە خوا ·وە هەروەها گفتوکۆ کردنە لە گەڵ خواوپەیمانو کردنەوەی بەندەیە لە گەڵ ئەو خوایەی کە ژیانو مردنو بوونو نەبوون خۆشیو ناخۆشی گشتی پەیوەندی بە فەرمانو بڕیاردانی ئەو زاتەیە · وە زۆر ترین لەو پاڕانەوەو گفتو گۆیەی بەندە لە گەڵ خوادا کە لە نوێژدا ئەیکات لە سوڕەتی فاتیحە دایە ·

جا لە بەر ئەمە ویستم کە مانای فاتیحە بۆ موسوڵمانان ڕوون بکەمەوە · تاکو بزانن کە چی ئەڵێن وە چ بەلێنێك لە گەڵ خوای خۆیان ئەدەن · بەڵکە پەیرەوی ئەو بەڵێنەیان ئەکەن · بە پێی توانا درۆ لە گەڵ خوای مەزن ناکەن · تاکو بەوەی نوێژەکەیان دروستو · پڕ سوود تر ببێت · نەخۆ هەر وەك تووتی · ئاواز بدەنو تێ نەگەن کە چی ئەڵێن · یاخۆ وەکو دەنگارە دەنگ بدەنەوە ·وە

نەزانن چی ئەبێژن ٠ یا دەم زەدە بکەن و هیچی لێ تێ نەگەن چونکو بە ڕاستی ئەمە شتێکی نا هەموارە وە دل پێ دانەمەزراوە ٠

چۆن ئەبێ مرۆ شتێك بلێ واتەی نەزانێ ، وەبەلێن بدات ٠وە نە بەلێنەکەی خۆی نەکات ، یا داوایەك بکات ٠ نەزانی چی داوا ئەکات ٠

جا گیانەکەم هەر چەندە کە زانایان فتوایان داوە کە مرۆ ئەگەر هیچیش لە واتەی فاتیحەو ووشەکانی نوێژ تێ نەگات ، نوێژەکەی دروستەو گیرایە ٠

بەلاّم بە ڕاستی من ئەم فتوایەم لە دلاّ نا چەسپێت وە بە شتێکی دوور لە بڕوا ئەزانم ٠

چونکە مرۆ کە داوایێك بکات ئەبێ بزانێ کە چی داوا ئەکات ، هەروا کە بەلێنێك ئەدات ، ئەبێ بزانێ بەلێنی چیە ئەیدات ٠

لە بەر ئەمە بێویستە هەموو گەلێك زۆر باش مانای فاتیحەو ووشەکانی نوێژی بۆ ئاشکرا بکرێت ، وە بەباشی لە واتەکەی بگەیاندرێت ، تاکو بزانن کە لە نوێژدا چی لە خوا داوا ئەکەن ٠وە چ بەلێنێکیش لە گەل خوا ئەدەن ٠ ئەمە ئەگەر وەرگێرانی قورئان دروست نەبێت ٠ ئەگەر نا هەر گەلە فاتیحەی بۆ وەربگێڕدرێتە سەر زوبانەکەی ،وە بەزوبانی خۆیان نوێژ بکەن ، وە گفتو گۆ لە

گەل خوا بکەن • جا لە بـەر ئەمە ویسـتم کە مانای فاتیحە بۆ برا موسولمانەکانی کورد بنوسم •

وە ئومێدەوارم کە کارەکەم پڕ سـود بیت ،وە خواش بۆم بنوسێت ،وە لە دوا ڕۆژدا پاداشم بدات جا با دەست پێ بکەین بە یارمەتی خوا •

محمد طه بالیسانی

١٤٠٣

## « سودێك له باسی خۆ پاراستن »

واته ووتنی ووشەی ( أعوذُ باللهِ من الشـيطان الرَّجيم ) ٠

گیانەکەم بزانە کە ئەم ووشەیە ئایەتێك نیە لە قورئانی پـیرۆز ،وە ئایەتێکیش نیە لە سـورەتی فاتیحە، بەڵام خوای مەزن فەرمویەتی ( فَاذا قَرأتَ القُرآنَ فأستَعِذْ باللهِ مِنَ الشیطانِ الرَّجیم ) واتە کە ویستت دەست بە قورئان خوێندن بکەیت پێش دەست بەخۆێندن کـردنی خـۆت بپارێزە لە شەیتانی دەرکراوو دوور خراو ٠

جا حەزرەت ( دروودی خـوای لە سـەر بێت ) فەرمانیدا کە هەر کەس بیەوێتقورئانبخوێنێت لە پێشدا بڵێت ( أعوذُ باللهِ مِنَ الشیطانِ الرّجیم ) واتە خۆم ئەپارێزم بە خوا لە شەیتانی دەر کـراوو دوور خراو جا هەر کەس دەست بە قورئان خوێندن بکات سوننەتە لە پێشدا ئەم ووشەیە بخوێنێ ، وە جیاوازی نیە خوێندنی قورئان لە نوێژدا بێت ٠ یان لەنوێژدا نەبێت ٠ وە لای هەندێ زانایان خوێندنی ئەم ووشەیە لە پێش قورئان خوێندندا لە نوێژو لە دەرەوەی نوێژدا فەرزەو واجبە ٠ بەڵام باری ئەوەی کە سوننەت بێت بە هێز ترە ٠

**پرسـیار :**

شەیتان کێیە کە مرۆ پێویستە بـە خواو هێزی خوا خۆی لێ بپارێزی ٠

**وەڵام :**

شەیتان بریتییە لە هەر کەسێك لە بانگت بکات بۆ خەرابە وە لادان لە فەرمانی خوای مەزن و ڕێگەی ئیسلام . جا ئەو کەسە جنۆکە بێت یا خۆ ئادەمیزاد بێت . چونکو خوای مەزن ئەفەرموێت ( و کذلك جعلنا لکل نبی عدواً شیاطین الأنس والجن یوحي بعضهم الی بعض زخرف القول غروراً )واتە ئێمە تەرخانمان کردووە بۆ هەموو پێغەمبەرێك چەند شەیتانێك لە ئادەمیزادو جنۆکە کە فەسادی ئەکەن و قسەی بەتاڵ ئەهێنن و ئەبەن .وە لە دژی ڕێگەی پێغەمبەران خەبات ئەکەن .وە هەم ئەفەرموێت ( ألخناس الذی یوسوس في صدور الناس من الجنة والناس )واتە ئەو شەیتانەی کە خەرابە ئەخاتە ناو دڵی خەڵك ،وە ئەو شەیتانە چ لە جنۆکە بێت وە یا لە ئادەمیزاد بێت .

جا هەر کەس خەڵك ڕابکێشیت بۆ خەرابە ئەوە شەیتانە . چ ئادەمیزاد بێت یا جنۆکە بێت . بەڵام شەیتانی ئادەمیزاد لە هی جنۆکە پیس ترو خەرابترە . چونکو هی جنۆکە بەس ئەتوانێت وەسوەسەو خەرابە بخاتە دڵت ،وە بە یادی خوا لا ئەچێت .

بەڵام شەیتانی ئادەمیزاد بە یادی خوا ناگەڕێتەوە وە شتی خەرابت بۆ ئامادە ئەکات وەبەرەو ڕوو

بانگت ئەگات بۆ خەرابە • وە وازت لێ ناهێنی جـا
گیانە ئەوەی بێ دینەو خـەڵك بانگ ئەدات بۆ بێ
دینی وە یا بۆ بیرو باوەڕێکی جیاوازی ئیسلام •
ئەمە شەیتانەو خۆتی لێ بپارێزە • وە بـە ڕاستی
لەم زەمانەدا ئەلێك زۆرو بێ ووچانن •

وە بۆیە خوا ناوی شەیتانی بە ڕەجیم بردووە
چونکو ڕەجیم بە مانا دەرکـراوو دوور خراوە واتـە
هەر کەس ڕوو لە بێ فەرمانی خوا بکات •وە خەڵك
ە ڕێگەو ئایینی خوا دوور خاتەوە ، وە بۆ ڕێگەیە لی
ر خەبات بکات • ئەمە شەیتانە وە خوا لـە دەرگای
ڕەحمـەتی دەر کـردووە وە دووری خستووە
•وە هەر چی موسـولمانیشـە ئەبێ دەری بکات
وەدووری بخات و هـاوکاری و دۆستایەتی لـە گەڵ
نەکات • جا ئەو کەسـە هەر کەسـێك بێت گەورە
بێت یا بچوك خزم بێت یـا دوور بـە هێز یا بێ هێز
چونکو ئەمە دوشمنتە وەمرۆ ئەبێ خۆی لە دوشمنی
خۆ دوور خاتەوە • چونکو خـوا ئەفەرموێت : ( انّ
الشـیّطانَ لکُم عَدوٌ فاتخـذوهُ عـدُوّا ) واتە
شەیتان دوشمنی ئێوەیە وەقەت نابێت بە دۆست •
جا ئێوەش بە دوشمنی بزانن وە دۆسـتی مەکـەن
وە لێی دوور کەون • ئیتر خوا دوورمان خاتەوە لە
گشت شەیتانێك

## ( واتەی ووشەکانی فاتیحە )

| ووشـــە | واتەکەی |
|---|---|
| أَعوذُ | خۆم ئەپارێزم |
| بِـالله | بە خوای مەزن |
| مِنَ الشيطان | لە شەیتانی |
| الرَّجيم | دەرکراو |
| بِسْمِ الله | بە ناوی خوا |
| الرَّحمنِ | بەخشندە |
| الرَّحيم | میهرەبان |
| أَلحمْدُ | هەموو سوپاسێك |
| لله | بەس بۆ خوایە |
| رَبِّ العالَمين | پەروەردیگاری هەموو بوونەوەرێکە |
| الرَّحمنِ | بەخشندەیە |
| الرَّحيم | میهرەبانـە |
| مالكِ | خاوەنی |
| يوم | ڕۆژی |
| الدِّينِ | سزایە |
| ايّاكَ | بەس تۆ |
| نَعْبُدُ | ئەپەرستین |
| وَاياكَ | بەس لە تۆ |
| نَسْتَعين | داوای یارمەتی ئەکەین |
| اهْدنا | بمانخـە |

| | |
|---|---|
| الصراط | سەر ڕیگەی |
| المُسْتقیم | ڕاســت |
| صراط آلذینَ | ڕێگەی ئەوانە |
| أَنعَمتَ | چاکەت کردووە |
| عِلیِهِم | لە گەڵیان |
| غیرِ المغضوب | نەك غەزەب |
| عَلیْهم | لێ گیراوان |
| ولا الضالّین | وە نەك گومرایان |

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم(١)

أَلْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعالَمينَ(٢) ألرَّحمن الرَّحيم(٣) مالِكِ يَومِ الدّين(٤) اِيّاكَ نَعبُدُ وَاِيّاكَ نَستَعينُ(٥) اِهْدِنا الصِّراطَ المُستَقيم(٦) صِراطَ الّذينَ أنعَمتَ عَلَيْهم غَيرِ المغضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلا الضّالّين(٧) آمينَ ٠

## ( پوختــەی واته )

( پوختەی واتەی فاتیحه بەم جۆرەیه ) ٠

بەس بە ناوی خودای بەخشندەو میهرەبان ئەم ئیشه ئەکەم(١) ٠

هەموو سوپاسێك بۆ خودایه که پەروەردیگاری هەموو بونەوەرێکه(٢) بەخشندەو میهرەبانه(٣) ٠

خاوەنی هەموو کارێکه لە ڕۆژی سزاو پاداشدا(٤)

بەس تۆ ئەپەرستین وە هەر لە تۆ داوای یارمەتی ئەکەین(٥) ٠

بمانخه سەر ڕێگەی ڕاست(٦) ڕێگەی ئەو کەسانەی چاکەت لە گەڵ کردوون ٠ ئەك ئەو کەسانەی کە غەزەب لێ گیراون وە نەك ئەو کەسانه کە ڕێگەیان گوم کردووە(٧) ٠

ـ داواکەم گیرا بفەرمو ـ

**ئاگاداریێك**

ووشەی ( آمین )ووشـەیەك نیە لە فاتیحـە • بەڵکو پێغەمبەر ( درووودی خـوای لە سـەر بێت ) فەرمویەتی ، چونکو لە ووشـەی ( اهدنا ) وە تاکو کۆتایی • داوایێکە لە خوا ئەکرێت •وە پاش هەموو داوایێك چاك وایە مرۆ بڵێ آمین • واتە ئەی خـوایە دواکەم بۆ جێ بە جێ بفەرمو •

جا با دەست بکەین بە واتەکردنی ئەم سـورەتە پیرۆزە بە درێژی بە یارمەتی خوای بێ هەمتا •

**( درێژەی واتەی فاتیحـە )**

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحیم

**کورتەی واتە :**

بەس بە ناوی خودای بەخشندەو میهرەبان ئەم ئیشە ئەکەم •

**درێژەی واتە :**

لە پێش ئەوەی کە دەست بە واتەی ( بسم الله ) بکەین بـە درێژی ، باس ئەکەین کە بۆچ خـوای گەورە لە سەرەتای قورئان وە لە سـەرەتای هەموو سورەتێکی قورئاندا ( بسم الله )ئەفەرموێت ؟•

* جا ئەڵێین ئەمە لە بەر چەند هۆیێکە •

**یەکەم :**

ئەمە فەرمانێکە کە خوا بە موسولمانان ئەکات ، کە هەر ئیشێکو شتێك ئەکەن لە پێش دەست پێ کردنیدا بڵێن ( بسم الله الرحمن الرحیم ) ٠وە ئەوەی کردە دروشمی خوا پەرستان ٠واتە هەر ئیشێك ئەکەن بە ناوی خودا دەستی پێ ئەکەن ،وە ئەلێن ( بسم الله الرحمن الرَّحیم )٠ یا خۆ ئەڵێن بە ناوی خودای بەخشندەو میهرەبان ٠ واتە هەر کەس بە گوێرەی زوبانو زاراوای خۆی ناوی خودا لەسەر ئیشەکە ئەبات ٠

**دووەم :**

گاورەکانی بت پەرست لە پێش هاتنی ئیسلامی پیرۆزدا ، کە دەستیان بە هەر کارێك ئەکرد ئەیان ووت بە ناوی (لات) یا بە ناوی هوبەل یا بەناوی عوززا ٠ واتە هەر کەس ناوی بوتێکی لەو بوتانە کە ئەیان پەرستن لە پێش دەست بەکار کردندا ئەهێنا ٠وە بە ناوی ئەوان دەستیان بە ئیشو کار ئەکرد ٠

جا کە خوا ئیسلامی پیرۆزی نارد وە (محمد)ی کرد بە پێغەمبەر ، وە قورئانی پیرۆزی بۆ نارد فەرمانی دا بە موسولمانەکان کە هەر بە ناوی خوا دەست بە فەرمانو ئیشو کار بکەن ٠وە بە هیچ ناوێکی تر جگە لە ناوی خودا دەست بە فەرمان نە

کەن ، وە ئیسلام بڕیاری دا کە هەر کەسێك جگە لە ناوی خوا لە سەر هەر کارێك ببات ، بە نەزان‌و پێ دانان لە شیرك‌و هاوتا دانان بۆ خوا ئەژمرێت • جا لێرەدا جیاوازی نیە ئەو ناوەی کـە ئەیبـات لەگەل ناوی خوادا بێت • وەك بڵێت بە ناوی خـوداو فلانە کەس • یان فلان شت ، چونکو ئەمە شـیرکو هاوتا دانانە بۆ خوا یا خۆ ناوەکە بە تەنها ببات،وەك بڵێت بە ناوی فلانە کەس وە یان فلانە شت •وە ئەوەش کوفرە •

هەر وەها جیاوازی نیە ئەو ناوەی کـە ئەیبات ناوی هەر شتێك بێت یا خۆ ناوی هەر کەسێك بێت وەك هەندێ جولەکە ئەڵێن بـە ناوی عـوزەیر یاخۆ هەندێ دیان ئەڵێن بەنـاوی مەسـیح ، یا خـۆ هەندێ کەس ئەڵێـت بە ناوی فولانە شـا یا فولانە سەرۆك ، یا هەندێ ئەڵێن بە ناوی گەل یا بـە ناوی نیشتمان • جا ئەوانە گشـتی دژی خوا ناسـین‌و موسولمانەتینە • وە پێ نانە لـە ڕێگـەی نەزانین‌و هاوتا بۆ خوا دانان •

جا کەوا بێت قەدەغەیە لە بۆ موسولمانان کە بـە هیچ ناوێك دەسـت بە هیچ ئیشێك بکەن جگە لـە ناوی خودای بە خشندەو میهرەبان •

## ( پرسـیار )

بۆچی قەدەغەیە کە جگە لە ناوی خودا بـە هەر ناوێکی تر دەست بە ئیش بکرێت ؟•

وەڵام :

لە پێشدا با پوختە ماناى ( بسم اللە )بۆت دوو پات بکەمەوە ، ئەوجا ئـەزانیت کە نابیت بە هیـچ ناوێکی تر جگە لـە ناوى خوودا دەسـت بە ئیش بکرێت ·

گیانە مرۆ کـە ئەڵێت ( بسم اللە )ماناى وایـە هێزو توانا بەس لە خـوا داوا ئەکەم لە سـەر ئەم ئیشە کە ئەیکەم ، واتە لە خـوام داوایە کـە هێزم بدات بۆ جێ بە جێ کردنی ئەم کارەم وە کۆتایی پێ هینانی ·

وە گومان نیە کەهیچ کەس جگە لە خواى مەزن، ناتوانێ هێزو توانا بـە هیـچ کەسێك بـدات ، بۆ هیچ کردەوەو کارێك ·

وە هەر کەسێ بڕواى وابێ کە جگە لە خوا هیچ شت یا خۆ هیچ کەس هێزو توانا بەخشە بۆ مرۆ ، ئەمە لە دوو جۆر بەدەر نیە ، چونکو یا واتێ ئەگات کە هێزو توانا لە دەست غەیرى خودایەو بەس ، وە ئەمە بە خوا نەناسو کافر ئەژمێررێت · وە یا وا تێ ئەگات کە هەر وەك خوا هێزو توانا ئەدات بە مرۆ ئەو ناوەى ئەیڵێت ئەویش ئەتوانێت هێزو توانا بە مرۆ بدات · ئەم جۆرەش بە هاوتا دانەر ( مشرك ) بۆ خوا ئە ژمێررێت ·

چونکو بە پێی بڕواى ئیسلام هیـچ کەس یـا هیچ شت توانا بەخشو هێـزدەر بۆ مرۆ نیە ، جگە

له خوای بەخشندەو میهـرەبان • ئیتر با بێینـەوە سەر درێژەی مانای ( بسم الله ) •

## [ بسم الله ]

پیتی بێ لە زوبانی عارەبیدا لێرە بە مانای هۆیە• بەم جۆرە مانای وا لێ دێت : بە هۆی ئیسـمی خوا دەست بەم ئیشە ئەکەم ، وە ئیسـم لە عارەبیدا بە مانا نیشانەیە وە بۆیە بە ناو ئەڵێن ئیسـم چونکو ناو نیشانەیە لە سەر مرۆ • وە ناودار بە ناوەکەی ئەناسرێت • واتە ئەگەر کەسێك ناو نرا بە حـەمە ووشەی حەمە نیشانەیە بۆ ئەوو بـەم ووشـەیە ئە ناسرێت • وە هەتا نە لێی حەمە وای کرد کەس نـا زانێ کە باسی کێیە وەکێ وای کردووە •

جا کە وا بێت هەر شتێك نیشانە بێت لە سەر بونی خوا ئەگونجێت بلێی ئەمە ئیسـمی خودایە • وە بوونەوەر گشتی نیشـانەیە لە سـەر هەبونی خوا • وە لەم بونەوەرە لە هەموی نزیك تر لە مرۆو ئاشکرا تر ئەو هێـزو توانایەیە کە خـوا بە مرۆی ئەدات بۆ ئیش کردنو کار کردن •

جا کە ئەلێی ( بسم الله )واتە بەو هێزەی کـە خوا پێم ئەدات ئەم ئیشە ئەکەم • واتە ئەگەر خـوا دەستەلاتم پێ نە دات خۆم هیچم بۆ ناکرێت وە هیچ توانایێکم نیە ، بۆیە یارمەتیو هێز لە خوا ئەخوازم وە بە هێزی ئەو ئەم ئیشە ئەکەمو بەس •

## ألرَّحمٰنِ الرَّحِيم

ڕەحمان‌و ڕەحیم هەردوکیان لە ووشـــەی ڕەحم وەرگیراون • وە ڕەحم بریتییە لــە گەرمێیــك‌و ئێشێك کەتوشی دڵی مرۆ ئەبیت وە ئەم گەر میەو ئێشە مرۆ هان ئــەدەن کە چاکەییێك لــە گــەل ئەو کەسە بکات کە دڵی بۆ گەرم بووەو ئێشاوە •

وە لەبەر ئەوەی دڵ گەرمی‌و دڵ ئێشان بۆ خوا ناووترێن ئەبێ کە ڕەحم بۆ خوا ووترا مـــەبەس دڵ گەرمی نەبێ ، بەڵکو مەبەس ئەنجــامی دڵ گەرمیە کە چاکەیە • جا ڕەحمی خوا بە مانای چاکەی خوایە کە وابێ ( ألرّحمن ) بە مــانای چــاکە کــردەو بەخشندەیە •

وە هەر وەها ( الرحیم)یش بە مانای چاکە کردەو خاوەن چاکەیە •

**پرســـیار :**

مادام ڕەحمان‌و ڕەحیم هەردوکیان بە مانا خاوەن چاکەو چاکە کردنن بۆچ هەر دوکیان ووتران ؟ ئایا یەکیکیان زێدە نیە ؟ وە شتی زێدە چۆن لە گوفتاری خوادا ئەبێت ؟•

**وەلام :**

ڕەحمان مانای وایە ئەو خوایەی کە چاکە ئەکات• وە هەر دەم چاکــەی پەیتـــا پەیتا نووو دوو پات

ئەبێتەوە بە سەر بەندەکانیدا وەك ڕوزی دانو ژیان بەخشین وە تەندورستی ومنال پێ دان ... هتد .

وە ئەو چاکانــەی پەیتــا پەیتان . ئەبێ لــە سیفەتێکی خواوە پەیدا ببن . وە ســیفەتێك هەبێ بۆ خوا کە ئەم چاکانە لەم سیفەتە پەخش ببن . جــا هۆی ئەو چاکانەو ئەو سیفەتەی کە ئەو چاکانەی لێ پەیدا ئەبنو ئەبێتە هۆی چاکــە کردنی خوا بە سەر ئادەمیزادو هــەموو گیان لــە بەرێك ئەو ســیفەتە [ چاکەیە ] .

جا چاکە سیفەتی خوایە وە لەو چاکەیە ڕۆژ بــە ڕۆژو پەیتا پەیتا چاکە بە ســەر ئادەمیزادو هەموو گیان لە بەرێك دا پەخشو بلاو ئەبێت .

کە وا بوو مانای ( ألرحمن الرحیم )وای لێ دێت ئەو خوایەی کە هەردەم پەیتا پەیتا چاکــە لــە گەل بونەوەر ئەکات ، وە چرکە بــە چرکە چاکەی بــەر دەوامو زێدە ئــەبێت ، وە هەمــوو جۆرە چاکەیەك ئەکاتو ئەبەخشێت ، وە ئەو چاکانەی لەبەر ئەوەیە ( الرحیم ) چونکو چاکە سیفەتی تایبەتی خــوایە . وەخوا حەز لە چاکە ئەکاتو پیشەی چاکە کردنە .

جا لە بەر ئەم ســیفەتەیە چاکەی هەمیشە لــە سەر هەموو گیان لە بەرێكدا پەخشــو پەرتو بلاوە نەك لە بەر هۆیەکی تر .

## ( ئاگادایێك )

لێرەدا مەبەسێك وەر ئەگیرێت وە ئەم مەبەسە بەم جۆرەیە ٠

خوا کە چاکە ئەکات بەس لە بەر ئەوەیە کە چاکە سیفەتی خوایە ، وە خوا حەز لە چاکە ئەکات وە لە بۆ هیچ شتێکی تر نیە ٠ چونکو خوا هیچ پێویستی نە بە چاکە هەیە ٠ وەنە بەوانە هەیە کە چاکەیان لە گەڵ ئەکات ٠ وە هیچ چاوەنوری سودێکی لە ئەنجامی ئەو چاکەیە نیە ٠ چونکە پێویستی بە کەس‌و سوودی کەس نیە ٠ بە پێچەوانەی ئادەمیزاد کە چاکەیەك ئەکات لە بەر ئەوەیە ئومێدێکی هەیە یا چاوەنۆری سوودێك ئەکا وە یا پێویستی بەم چاکەیە هەیە ٠ هیچ نەبێت گەرمی‌و ئێشێك توشی دڵی ئەبێت‌و هانی ئەدات کە ئەم چاکەیە بکات جا بۆ ئەوەی ئەم ئێشە لابچێت‌چاکە ئەکات ٠

جا زۆر کەم هەیە کە مرۆ چاکەیەك بکات ٠ وە ئومێدی سوودێك‌و پاداشێکی لەو چاکەیە نەبێت ، هیچ نەبێ حەز ئەکات کە بەم چاکەیە ناوی بە باش ببردرێت، یاخۆ سوپاسێکی بکرێت ٠ وە ئەگەر مرۆ زۆر زۆرچاك‌و پاك‌بێت٠چاوەنوری پاداشی دوا رۆژی لە خزمەت خواوە هەیە ئیتر ئەو چاکە کردنە هەر چەند باشە بەڵام ناگاتە پلەی ئەو کەسە کە چاکە ئەکات بەس بۆیە ئەیکات کە چاکە چاکە ٠ وە

سیفەتی خوایەو خوا فەرمانی پێداوە • وە بەم جورە کەسانە لە زوبانی قورئانــدا ئەڵێن ( مقربین )واتە نزیکانی خوا • وە ئەم پلەیە پلەی پێغەمبەرانو خوا پەرستانی هەرە بەرزن •

حەزرەتی عائیشە ئەفەرموێت کــە چاکەمان لە گەڵ یەکێك ئەکــرد یەکێکمان بــە دوادا ئەنارد کە ئەگەر دوعامان بۆ بکات دوعای بۆ بکاتەوە نــەوەك دوعاکــەیان ببێتە پاداشــی چاکەکەمان • جــا ئەم چاکەیە بــە چاکــەی هەرە بــەرز دا ئەنرێت • وە نیشانەی ئەو چاکە ئەوەیە کە مرۆ چاکە لەگەڵ ئەو کەسانەش بکات کە خەرابەی لێ دیون ، هــەر وەك حەزرەت ئەفەرمویت (أحْسن الیٰ مَن أساء الیْك) • واتە چاکە لە گەڵ ئەو کەسانەش بکە کە خەرابەیان لەگەڵ کردی •

وە شێخی سەعدی ئەڵێت •

بەدی با بەدان سەهل آید جەزا •

ئەگەر مەردی (أحْسِن الی من آسا )

لە بەر ئەمە مرۆ تاکو بەو پلەیە نەگات لــە خوا نزیك نابێــت • وە ئەو پلەیە هــەموو کــەس پێی ناگات•هەر وەك خوای مەزن لە قورئاندا ئەفەرموێت ( ادفع بالتي هــي آحســن فَاذا الّذیّ بَیْنَــكَ وَبَیْنَهُ عَداوَة کَأَنَّهُ ولي حَمیِم ) •

واتە خەرابەی خەڵك بە چاکە کردن لــە گەڵیان لابدە جا کە وات کــرد ئەوەی دوژمنتــە ئەبێتــە دۆستێکی زۆر گەرم ٠

پاشان ئەفەرموێت : ( وما يلقّاها الاّ الـذينَ صبروا وَمَا يُلَقّاها الاّ ذُو حَظٍ عَظيم ) ٠واتە ناگاتە ئەم سروشتە کــە بەرامبەر بە خــەرابە چاکە بکات جگە لەو کەسانە کە زۆر خۆ گرن وە جگە لەو کەسانە کە خوا بەشێکی زۆری لە ڕەووشــتی چاکو پاکی پێ داون ٠

## [ ســوودێك ]

ئایینی ئیسلام لە بەر دوو شت قەدەغــە ئەکات کە بە هیچ ناوێك جگە لە ناوی خوا دەست بە ئیش بکرێت وە یا هیچ ناوێك جگە لە ناوی خوا لە ســەر ئیش کردن بهێنرێت ٠

یەکەم ئەوەیە کە ووتمان چونکو بە هەر ناوێك کە دەست بە ئیش ئەکرێت ، واتە هێــزو توانا بۆ ئەم ئیشە لە خاوەن ناوەکە داوا ئەکرێت ، وە لە بیرو بروای ئیســلام هیچ شــت ناتوانێت هێــزو توانا ببەخشی جگە لە خوا ٠

وە هەر کەســێك بڕوای وا بێت کە جــگە لــە خوا هیچ شت یان هیچ کەس ئەتوانێت تواناو هێز بدات ، ئەم جۆرە کەسە بە لادەر لە ئایینی ئیسلام ئەژمێررێت وە بە هاوتا دانەر بۆ خوا ئەناسرێ ٠

دووەم شت ئەمەیە کە ئیسلام ئاینێکی کشتیو جیهانییە،وە بۆیە هاتووە کە هەموو چینی ئادەمیزاد لە ژێر سایەی ئەو یاسایەدا کۆ ببنەوەو بژین وە بە گوێرەی ئەو لە هەموو ئیشو کار دا بجولێنەوە ، وە ئامانجی ئیسلام یەکیەتی ئادەمیــزادو ڕێك کەوتنی هەموو چینێکە ، لە ســەر یەك ڕێگەو یەك دەستور تاکو بە هەمویان ئەو زەمینە ئاوەدان بکەنەوە ٠ جا یەکیەتی نایێتە جێ تاکو گشتیان یەك ئامانجو یەك دروشمو یەك بڕوا نەبن ٠ لە بەر ئەمە خوا دروشمی موسولمانانی وا دانا کە بۆ هەموو گەلێكو هەمــوو چینێك بشێت وە هەموو کەس بتــوانی لە ژێر ئەو دروشمە کۆ ببیتەوە ، چونکو هیچ جیــاوازی تێدا نیە ٠ وە پەیوەندیێــکی تایبەتی بە هیــچ گەلێكو چینێکەوە نیــە ٠ وە ئــەو دروشمە دروشــمی خوا پەرستیو پەیرەوی یاساو فەرمانی خوایەو ، خوا بە گەورەو خاوەن دانانە ٠

جا ئەم دروشــمە وەك ووتمان هیــچ پەیوەندی تایبەتی بە هیچ گەلێكو چینێکەوە نیە ٠

بەرامبەر بە هەمویان یەك جۆرو بێ جیاوازیە ٠ وە لەبەر ئەمە لە هەموو دروشمێك چاکترو باشترە بۆ یەکیەتی ئادەمیزادو ڕێك خستنیان لە سەر یەك ئامانجو یەك مەبەس ٠ وە ئیش کــردن پێکەوە ٠ بۆ ئاوەدانی زەمینو بۆ کەلکی گشتی ئادەمیزاد ٠

# ڕوون کردنەوەیێك

هەر وەك ووتمان هیچ دروشمێك وەك دروشمی ئیسلام کە خوا پەرستنو پەیرەوی یاسای خوایە ئادەمیزاد کۆ ناکاتەوە وە نایانکات بە یەك بۆ ئاوەدان کردنی زەمینو ژیان بەڕێوە بردن لە ژێر سێبەری هێمنیو یەکیەتی وبێ جیاوازی • چونکو ئەگەر دوای دروشمی نەتەوەیی ئەکەوێت واتە خێرو سوودو کەلکت بەس بۆ نەتەوەی خۆت ئەوێت •

جا تەنیا ئەم نەتەوەیە ئەتوانی کۆ بکەیتەوە لە ژێر ئالاّی یەکیەتی • وە لە لاییێکی ترەوە لە لای نەتەوە کانی تر کینە پەیدا ئەکات وە ئەبێتە هۆی بەربەرەکانی نەتەوایەتی • وە ژیانی ئادمیزاد تاڵ ئەبێتو ئەبێتە پارچە پارچە هەر یەکە دژو دوژمن بە یەکترو هەردەم جەنگو برا کوشتن لەسەر چی؟هەر لە سەر ئەمە تۆ سپیتو من ڕەشم، یا من سوورمو تۆ زەردێت ، هیچ کات بیر ناکەن کە هەمویان لە یەك دایکو باوکێکین کە ئادەمو حەووان • وە ئادەمیزاد گشتی برایە • وە ئەبێ هەمووی لە ژێر ئالاییێکی گشتیو دروشمێکی بێ جیاوازی ئیش بکەن بۆ هیمنیو بەرهەم هێنانی ژیان بۆ گشت ئادەمیزاد •

جا ئەم دروشمە دروشمێکی ژیان بەخشو هۆی کینەبەڕییە نەك هۆی یەکیەتیو سوودی گشتیو هێمنیو ئاسایش بەخش بۆ چینی ئادەمیزاد جا ئەم

ڕژێمە ڕژیمێکی ڕاســـت نیە چونکو مرۆ ئەبێ سوودو کەلکی بۆ گشت ئادەمیــزاد بوێت • نەوەك بۆ چینێــکی تایبەتیو بــەس • چونکو هــەرچی ئادەمیزادە براتە ئەگەر نێرە • وەخوشــکتە ئەگەر مێیــە •

## [ تێبینی ]

لێرەدا مەبەس ئەوە نیە کە مــرۆ نەتەوەی خۆی لە بیر بکات وە خۆشی نەوێت یــا ڕووی چــاکەی بۆ نەتەوەی خۆی نە بێتو بۆیان هەوڵ نــەدات چونکو ئیسلامیش ئەوەی ناوێت ، بەڵکو مەبەس ئەوەیە کە نەتەوایەتی نەکەیتە بنچینەی ئیش کــردنو هەوڵ بدەی ستەم لە نەتەوەکــانی تر بکــەیت وە بیــان خەیە ژێر دەستی خۆت بۆ چەوساندنەوەو خــوێنو ماڵ مژتنیان بۆ ئەوەی نەتەوەکەت سوود وەرگرێت وە لە سەر حیسابی نەتەوەکانی تر لافو گزاف لێ بدات • وە ژیانی فراوان دەســـت بخات • بەڵــکو ئیسلام ئەیەوێت کە هــەموو نەتەوەیێــك پێکەوە بژین • وە یارمەتی یەکتر بدەن • وە ستەم لە یەکتر نەکەن • وە هیچیان دەست بۆ مافی ئــەوی تر درێژ نەکەن ، هەر وەك خوا لــە قوڕئانــدا ئــەفەرموێت ( وَجَعَلْنَاكُم شعوباً وَقَبَائِلَ لِتَعارَفوا )واتە ئێوەم گێڕاون بە چین چینو نەتەوە نەتەوە بۆ ئەوەی گشتتان دۆستی یەکتر بکەنو یارمەتی یەکتر بدەن

نەك بەربەرەكانیو دژایەتی یەكتر بكەن وە زیان لە یەكتر بدەن ·

**دووەم :**

ئەگەر دوای دروشمو ڕژێمی زەمینی ئەكەویت بێ گومان خاوەنی ئەم یاسایەو ڕژێمە پەیوەندی بە نەتەوەیەكەوە هەیە وە دانیشتوی جێگایەكەو پەروەردەی جۆرە شتێكە وە هەموو كەس لەوانە نیە كە مل كەچی بكات بۆ یاساو فەرمانی یەكێك كە وەك خۆی ئادەمیزادە بە تایبەتی ئەگەر پەیوەندی بە نەتەوەێیكی جیاواز لە نەتەوەی خۆی هەبێت كەوابی وەك یاسای خوا نابێتە هۆی یەكیەتیو دوا كەوتنو پەیرەوی بۆ هەموو كەسێكو هەمووچینێك ·هەروا هیچ یاسای زەمینی وەك یاسای خوا بە كەلكو باشو بە سوود نیە · چونكو ·

**١ ـ یەكەم :**

خوای مەزن ئادەمیزادی دروست كردووە جا ئەو ئەزانێ چی بۆی باشەو چی بۆی خەرابە یا چی بە كەلكەو چی پڕ زیانە ، هەر وەك خۆی ئەفەرموێت ( ألا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ )واتە ئەوەی خەلكی دروست كردووە ئەویش پێویستو قازانجو زیانی ئەم خەلكە ئەزانێت وە لە سوودو كەلكی تێ ئەگات · جا بە گوێرەی ئەم زانینە یاسای بۆ داناوە كە لە سەر ئەم

یاسایە بژێت وە شتێ کــە زیانی هەبێــت لێی قەدەغە کردیە • وە شتێکی پێویست بێت واجبی کردیە • وە هەندێ شتی بە پەسند داناوە • وە هەندێ بەناپەسند وە هەندێ شتی تەرخان کراو کردووە بەڵام ئادەمیزاد هەر چــەند باڵاو زاناو دانا بێت • ناگات بــە زانینی خــواو ناتوانێ یاسایێکی وەك یاســای خــوا پوختــو پاکو پر سوودو بێ لەکە دا نێ • بۆیە خــوا ئەفەرموێت [ قُلْ لَئِــنِ اجْتَمَعَتِ الأنْسُ وَالْجِنُّ عَلَى أن يَأتوا بِمِثْلِ هذا القُرآنِ لايَأتونَ بِمِثْلِه وَلَو كانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهيراً ]واتە بڵێ ئەی (محمد) ئەگەر ئادەمیزادو جنۆکە گشتیان کۆ ببنەوە کــە یاسایێــكو بەرنامەیێکی وەك قورئانی پیرۆز دابنێن ناتوانن ، بــا هەندێکیش پیشتیوانی هەندێکی تر بکەن •

**٢ ـ دووەم :**

هەر ئادەمیزادێك کە یاســا دائەنێت بێ گومان خەلکی جێگەیێکە وە پەیوەندی بە نەتەوەیێــك هەیە • وە پێویســتو کــەمو کورتی جێگــەو نەتەوەی خــۆی ئەزانیــت وە بەپێی جێگــەو نەتەوەکە خووی بە هەندێ ڕەوشت گرتووە وە بەندی ســروشتو ڕێچەنو خوشــەویســتی نەتەوەکەیەتی •

ج ئەم هەموو شتانە بێ گومان کاری لێ ئەکەن وە نەتوانی کە یاسایەکەی بەبێ جیاوازی دابنێ بە جۆرێکی وا کە بۆ هەموو گەلێك بشێت • هەر وا هەرگیز بروا ناکرێت کە یاساکەی بە لایێکەوە لا نەکاتەوە وە لە لایەنگری پاك بێت وە یا خۆ پێویستی هەموو گەلێك بزانیت • وچارەسەری بکات •

بەڵام خوای مەزن بۆ هەموو نەتەوەیێك وەك یەك وایە • وە دورو پاکە لە لایەنگیری•وە پێویستی هەموو گەلێك ئەزانی بۆیە یاسای ئەو یەك ڕەنگ و یەك سایە وە جیاوازی تێدا نیە •وە بۆ هەموو ئادەمیزادو هەموو گەلێك ئەشێت و دەست ئەدات وەچارە سەری هەموو گەلێك و چینێك ئەکات •

**٣ ـ سێیەم :**

ئادەمیزاد هەر چەندە کە زانا بێت هەردەم شایانی هەڵەو بە هەلە چونە لە بەر ئەمە یاساکەی زۆر هەڵەی ئەکەویتێ ، هەر بۆیە ئەبینین کەسانی کە یاسا دائەنێن هەر ساڵە بە جۆرێکی ئەیگۆڕن ،هەر وەك خوا ئەفەرموێت [ وَلَوكانَ مِن عِنْدِ غَيرِ اللهِ لَوَجَدُوا فيه أخْتِلافاً كَثيراً ] •واتە ئەگەر قورئان لە لای خوا نەبوایە ئەیاندیت جیاوازیو ناڕێکییێکی زۆری تێدا هەیە • بەڵام چونکو لای خوایە هیچ جیاوازیو ناڕێکی تێدا نیە •

## ٤ ـ چوارەم :

هۆشو بیروو هەستی خەڵك زۆر جیا جیاو جۆر جۆرە ، ئەوەی تۆ بە باشی ئەزانیت یەکێکی تر بە خەراپی ئەزانی ، وە ئەوەی تۆ بە سوودی تێ ئەگەیت یەکێکی تر پڕ لە زیانی دێتە پێش چاو ٠

لە بەر ئەمە ئەگەر یاسا دانان لە دەست ئادەمیزاد بێت ، هەر کەسە بە جۆرێك بڕیار ئەدات‌و ڕێك ناکەون کە یاسایەکی گشتی دابنێن‌و ببێتە هۆی یەکیەتی ئادەمیزاد لە ژێر سێبەری ئەم یاسایەدا ٠

## ٥ ـ پێنجەم :

هەر یاسایێکی ئادەمیزاددییە ٠ مرۆ بەس بە ئاشکرایی لە خەراپە ئەگێڕێتەوەو نەیهێنیتە سەر چاکە ، چونکو خاوەنی یاساو یاسا بەرێوەبەر بەس دەستەلاتی ئاشکراییان هەیە ٠ بەڵام یاسای خوا بەدوو جۆرە سەزا مرۆ هان ئەدا بۆ چاکە وە لە خەرابەی ئەگێڕێتەوە ٠

یەکەم بە سزای ئاشکرا ئەگەر لێی ئاشکرا ببێت ٠ لە دونیا ، دووەم بەسزای خوا ٠ واتە ئەگەر ئاشکرا نەبێت لە دونیا نە قیامەتدا سەزای ئەدات ٠

جا یاسای خوا بە دڵو دەروون مرۆ لە خەرابە کردن ئەگێریتەوە ٠ بەڵام یاسای زەمینی بەس بە چاو مرۆ لە خەراپە ئەگێریتەوە ٠ واتە ئەگەر بە دزی

خەراپەی کرد بێ سـەزا ئەڕروات ، وە ئەگـەر بە ئاشکرایی بوو هەم ئەتوانی بە هۆیێك لە سەزا دەر چێت · بەڵام لە یاسـای خوا مرۆ هەسـتی وایە کە هەرگیز لە سەزا دەر ناچێت ، ئەگەر لە دونیا سەزا نەدرا لـە دوا ڕۆژدا لێیان بەسـەر ناچێـت وە لە دەستی خوا ڕزگار نابن·جا بۆیە لە زەمانی حەزرەت خەڵك کە شتێکیان ئەکرد، بە خۆیان ئەهاتن عەرزی حەزرەتیان ئەکرد کـە شـتێکی وامان کـردووە سەزامان لێ وەرگرە تاکو بۆ دوا ڕۆژ پاك ببینەوە·

## [ کۆتایی ]

جا خوای مـەزن فەرمانی پێ کردوین کـە پێش هەموو ئیشێك بڵێین [ بسم الله الرحمن الرحيم ] بۆ ئەوە کە بە ناوی خودا ئیش بکەین ، وە هێزو توانا بەس لەو داوا بروین، وە هەموو ئیشێك بە گوێرەی فەرمانی ئەو بکەین ، وە لە سەر ڕێگەو ئایینی ئـەو بجولێینەوە لە هەموو کردەوەیێك وە لە ژێر یاساى فەرمانی ئەو بکەین ، وە لە سەر ڕێگەو ئایینی ئەو ئەو بژین ·

جا بەم جۆرە هەموو ئیشێکمان پڕ خێرو فـەڕو پیتو بەرەکەت ئەبیت · وە ئەگەر وا نەبێت هەموو کارێکمان بێ فەڕە ·

حەزرەت دروودی خوای لە سەر بێت ئەفەرموێت ( كُلُّ أمْرٍ ذي بالٍ لَم يُبْدأ فيـه بـالبسَمَلة فَهُوَ أبْتَرُ )واتە هـەر کارێکی بە کـەڵك بێت لە

سەرەتایی ناوی خوای لە سەر نەبرێت ئەم کارە بێ خێرو پیتو فەڕە ٠

وە بە پێچەوانەی ئەوە هەر کارێکی بەڕێز بێت واتە لە شەرعدا حەڕام نەبێت ٠ ئــەگەر ناوی خوای لە سەر هات وە بە پێی شـــەرع کرا ئەمە پڕ خێرو فەڕە ، وە هەم بە عیبادەت بۆ خاوەنی ئەنوسرێت بە جۆرێکی وا مرۆ کە خواردنو خواردنەوەش بەم جۆرە ئەکات بۆی بە عیبادەت ئەنوسرێت ٠

حەزرەت دروودی خــوای لە ســـەر بێت ڕۆژێك باسی چاکەو خێرانی ئەکرد ، فەرموی ئەو لوقمەی لە دەمی منــاڵت ئەنێی خێرو عیبــادەتە ٠ وە ئــەو لوقمەی لە دەم خێزانت ئەنێی خێرو عیبادەتە ٠

ئەمە عیبادەتە٠٠٠ئەمە خێرو عیبادەتە٠٠٠ هتد تا کو هاتە سەر ئەمە فەرموی ئەو ئاوەی کە ئەخەیتە ناو منداڵدانی ژنت عیبادەتەو خێرە ٠ عەرزیان کرد قوربان ئێمــە بۆ ئارەزووی خۆمــان ئەچینــە لای ژنەکانمان چــۆن خێرە ؟ فــەرموی ئایا ئەگەر لــە حەڕامی دا بنێیت گوناهــە ؟ ووتیان بەڵی ٠ فەرموی کە وابێ کە لە حەلالی دای ئەنێیت خێرەو عیبادەتە ٠

جا مرۆی موسولمان هەموو ئیشێکی بە عیبادەت بۆ ئەنوسرێت مادام بە گوێرەی شەرع ئەیکات ، وە ناوی خوای لە سەر ئەبات ٠

وە بە پێچەوانەی ئەوە هەر شتێکی ئەیکــات بە هیچ دەر ئەچێــت ، بــە جــۆرێکی وا ئەگەر مرۆ

نوێژیش بکات بە گوێرەی شــەرع نەبێت بە هیــچ ئەڕوات • بــەڵام کــە خواردن بــە گوێرەی شەرع ئەخوات بە عیبادەت بۆی ئەخــرێتە دەفتــەری کردەوەکانی •

جا براکەم هەر چی ئەیکەی بە حەلالی بیکە وە لە سەرەتا ناوی خوای لە سەر بێنە وە لە دواییدا بڵی ( ألحمد لله )، واتە سوپاس بۆ خوا • جــا ئەگەر وا بکەیت ئەو شتەت بە عیبــادەت بۆ ئەنوســرێت وە ئەخرێتە دەفتەری خێرانت • وە ئەم باســە بە درێژ تر باس ئەکەین لە کاتی مانا کردنی [ایاكَ نَعْبُدُ] خودا یارمەتی بدات •

[ ألحَمْدُ لله ]

واتە هەر سوپاسێکی هەبێت گشتی بۆ خوایە• وە هەموو سوپاسێك بەس شــایانە بۆ خواو بەس

**درێژەی واتە :**

**پرسیار :**

بوچ هەموو ســوپاسێك بەس بۆ خــوایە • وە بۆچ هەموو سوپاسێك شایانی خوایەو بەس •

**وەڵام :**

جا بۆ ئەو وەڵامە پێویســتە بزانین کە حەمــد لە زوبانی عارەبیدا مانای چیە •

جا برا گیان بۆ سوتاییش کـردن لـه زوبانی عارەبیدا سێ ووشه هـەن ٠ یەکەم حـەمد ، دووەم شوکر ، سێیەم مەدح ٠ جا ئەو سـێ ووشەیە هەر یەکە مانایێکی تایبەتی هەیە وە لە جێگییێکی تایبەتی بەکار ئەهێنرێت ٠ جا پێویستە کە مانای ئەم سێ ووشەیە بزانیت ئەوجا ئەزانیت کە حـەمد بەس بۆ خوایە ٠ وە هەموو حەمدێك شایانی خوایەو بەس جا با دەست بە مانای ئەم سێ ووشەیە بکەین ٠

**یەکەم (حەمد) :**

حەمد بە سوپاسێك ئەڵێن کـە بەرامبـەر بـە سیفەتێکی چاكو پەسـند بیـت ٠ جا ئەو سیفەتە چاکەییێك بێت بگاتە حەمدکار وەك کەسێك کە خوا منالێکی پێ ئەدات وە ئەڵێت سـوپاس بۆ خوا ، یان ئەلێت ( ألحمد للـه ) ٠ یا خۆ سـیفەتەکە چاکەییێك نەبێت کە بگاتە حـەمدکار ، ٠ وەك یەکێك هەر لـە خۆیەوە ئەڵێ سوپاس بۆ خوا ، خوا چەند گەورەیە بێ ئەوەی بەرامبەر کردەوەییێکی چاك بێت کە بگاتە حەمەکار ٠ بەڵام مەرجی ئەو سوپاسەی کە بە حەمد ناو ئەبرێت ٠ دوو شتە ٠ یەکەم ئەبێ ئەم سوپاسە بە دەم بکرێت نەك بە دڵ وە نەك بە کـردەوە ، کە وابێ ئەگەر یەکێك کـە لە بەڵاییێك دەرباز ئەبێتو سەجدە ییێك بۆ خوا ببات ئەو سەجدەیە سوپاسە بە مانای شوکر نەك حەمد ٠

مەرجی دووەم ، ئەبێ ئەو سـیفەتەی کـە حەمد

كراو هەیەتی سیفەتێکی سەربەخۆیی بێت واتە ( زاتی ) بێت ، وەهیچ کەسێك دەخلی لەم سیفەتە دا نەبێت ، وە کە چاکە ئەکات خود موختار بیت هیچ شتێك پاڵی پێوە نە نێت وە هیچ کەسێك هاوبەش نە بێت لە بە جێ هینانی ئەم چاکەیە ٠ وەك خوا کە حەمدی ئەکرێت بەرامبەر عیلمی عیلمەکەی سیفەتێکی زاتی خۆیەتی وە لە بونی هیچ کەس دەستی تێدا نیە ٠ بەڵام کە سوپاسی ئادەمیزادێك ئەکەیت بە عیلم ئەو عیلمە زاتی نیە بەلکو پاشان بۆی پەیدا بووە ٠ وە لە پێشدا جاهیل بووە وە هەم خۆی سەر بە خۆی ئەو عیلمەی بۆ نە بووە ، بەلکو خوا یارمەتی داوە وە بۆی خەلق کردووە ٠

وە یا کە یەکێك حەمدی خوا ئەکات کە منالێکی پێ داوە یا مالێکی پێ بەخشیوە ، ئەمە سوپاسی خوا ئەکات لە بەرامبەر سیفەتێکی خوا کە چاکەیێکە گەییشتوتە حەمدکار ٠ وە خوا لەم سیفەتەو لەم چاکەیە خود موختارە وە هیچ شت پاڵی پێ وەنەناوە کە ئەم چاکەیە لە گەڵ ئەو حەمد کارە بکات ٠ وە کەس یارمەتی نەداوە بۆ جێ بە جێ کردنی ئەم چاکەیە ٠

بەڵام ئەگەر کەسێك سوپاسی کەسێك بکات بە رامبەر ئەوە کە مالێکی پێ بەخشیوە ئەم سوپاسکراوە لەو چاکەیەدا سەر بەخۆ نیە بەلکو خوا یارمەتی داوە وە دلی نەرم کردووە کە ئەو

چاکەیە لە گەڵ حەمدکار بکات ٠ وە هەم بێ گومان شتێك پاڵی بە سوپاس کراو ناوە وە هانی داوە کە ئەو چاکەیە بکات لە گەڵ ئەو کەســە وەك ئومێدی پاداشێکی دونیــایی لــەو کەســە یا پڕکردنەوەی چاکەییك لە لایەن حەمدکراو یا بــەزەیی پێ کردنی یا ٠٠٠ یا ٠٠٠ هتد ٠

ئەگەر هەر نەبێت وە پیــاوێکی زۆر باش بێت ئومێدی پاداشی قیامەتی لە خــزمەت خــوای مەزن هەیە بەڵام خوا کە چاکە ئەکات هیچ شت پاڵی پێوە نا نێت چونکو پێویســتی بە کەس نیــە وە ئومێدی پاداشی لە کەس نیە ٠ وە لە چاکە کردنــدا کەس یارمەتی نادا ٠ وە بۆی ڕێك ناخات ٠وە لە چاکەکەی سەر بە خۆو خود موختارە ٠ جا لە بەر ئەو هۆیانە هەر حەمدێك هەبێت بۆ خوایە ، وە حەمد بۆ غەیری خوا ڕاست نیە ٠ جــا ئەگەر لــە جێگایەك دیتت کە حەمد بۆ بەندە کراوە ٠ ئەمە ووشەی حەمد بە مانای مەدح بە کار هێنراوە ٠ وە مەجازە حەقیقەت نیە ٠ وەك عبدالمطلب کە حەزرەتی ئامینە پێغەمبەری بو ٠ ناوی نا (محمد) ، ووتیان بۆچ وات نــاو نا خۆ ئەم ناوە لە ناوی باپیرانو پێشینیەکانی ئێمە نیە ، ووتی بۆیە نــاوم نا ئومیــد ئەکەم کــە حەمدی بکرێت لە ئاسمانو لە زەمینــدا ٠ بە ڕاستی واش دەرچــو ٠ چونکو لە دواییدا خوا کــردی بە پێغەمبەر ٠ وە لە ئاسمان مەلائیکە مەدحی ئەکــەن ، وە لە زەمینــدا

ئادەمیزاد مەدحی ئەکات ، هەر وەك خوا ئەفەرموێت [ انّ الله وملائكته يصلون على النبي يا أيها الّذين آمنوا صلوا عليه وسلموا تسليما ] ٠

جا ڕۆژ نیە کە لە زەمین ملیۆنەها کەس سەلاوات لە سەر حەزرەت لێ نەدات ٠ وە باسی بە چاکەی نەکات ٠ جا لێرەدا پێغەمبەر دروودی خوای لە سەر بێت (محمد)ە یان (محمود)ە واتە مەدح کراوە نەك حەمد کراو ٠ چونکو حەمد بەس بۆ خوایە ٠

دووەم :

بۆیە هەموو سوپاسێك بەس شایانی خوایە ، چونکو ووتمان حەمد سوپاسە بەرامبەر سیفەتی چاکە ٠ جا کەسێك شایانی گشت حەمدە کە هەرچی سیفەتی چاکە هەیە لەو کەسە بێتە جێ ٠ وە هیچ کەس نیە کە هەموو سیفەتی چاکەی لێ بێنە جێ جگە لە خوای مەزنو بێ هەمتا ٠

جا بۆ وێنە با بڵێین پێغەمبەر ( دروودی خوای لێ بێ ) کە لە هەموو بونەوەرێك گەورە ترو خاوەنی چاکە ترە هەموو سیفەتی چاکەی لێ نە هاتونە دی چونکو یەك لە سیفەتی چاکە ئەوەیە کە هەموو شتێك لە کاری دونیاو دینو کاری قیامەت بزانیت وە پێغەمبەر ئەو سیفەتەی نیە بەڵام خوا ئەو سیفەتەی هەیە وەك ئەفەرموێت [ انّ الله بكل شيء عليم ]واتە خوا هەموو شتێك ئەزانیت وە پێ

ئاگاداره جا هەروا زۆر سیفەتی چاکە هەنە کە بەس بۆ خوا هەنە وەك :

( خالق )واتە دروست کردەی شت ·
( رازق )واتە ڕوزی بەخش ·
( محي )واتە ژیان بەخش ·
( ممیت ) واتە گیان لەبەر بڕ ·
( فعال لما یرید )هەرچی حەز بکات ئەیکات ·
( علی کل شیء قدیر ) لەسەر هەموو شـتێك توانای هەیە ·

جا سـیفاتی وا زۆرن کـە مرۆ تەماشـای ناوە جوانەکانی خوا ئەکـات ئەزانیت کـە کام سیفەت بەس بۆ خوا هەیە وە بۆ هیچ کەسی تر نیە · جا لە بەر ئەوە هەر خوایە شایانی هەموو حەمدێك بێت· جا لە بەر ئەوە کە حەمد بەس بۆ خوایە نە لە قورئانو نە لە حەدیس نادۆزرێتەوە کە حەمد بۆ غەیری خـوا بەکار هێنرا بێت ·

## ( ووشەی دووەم شوکر ) :

شوکر بەس بەو سوپاسە ئەوترێت کە بەرامبەر بە چاکەییێك بێت کە لە سوپاسکراو بگاتە سوپاس کار · بەڵام ئەو سوپاسە جیاوازی نیە چ بەدەم بێت وەك بە زوبان سوپاسی خـوا ئەکـەیت لەسـەر چاکەکانی کە لە گەڵی کردویت · یا خۆ ئەو سوپاسە بە لەش بکرێت وەك مرۆ سەجدەی سوپاس ئەبات

بۆ خوا بەرامبەر بە مە کە بەڵایێکی لە سەر لاداوە ، یا بەرامبەر بە چاکەو قازانجێکی نوو کە پێی بەخشیوە یان لە بەرامبەر چاکە یێك کە لە گەڵی کردووی ٠

وە هەم ئەم سوپاسە بە دڵیش ئەبێت وەك خوات خۆش ئەوێت بەرامبەر بە چاکەکانی کە لە گەڵی کردووی ، وە یان ئادەمیزادێکت خۆش ئەوێ بەرامبەر بە چاکە کردنی لە گەڵتا ٠

**تێبینی :**

جا شوکر لەگەڵ حەمد کۆ ئەبێتەوە لەو جێگەدا کە مرۆ بەزوبان سوپاسی خوا ئەکات بەرامبەر بە چاکەکانی ٠ جا ئەم جۆرە سوپاسە ٠ هەم حەمدە هەم شوکرە ٠

وە حەمد لە شوکر جیا ئەبێتەوە لەو جێگەدا کە مرۆ بەزوبان سوپاسی خوا ئەکات بەرامبەر بە سیفەتێکی کە چاکەیێك نیە گەیبێتبێتە سوپاس کار وەك یەکێك بەزوبان بڵێت ماشاءالله خودا چەند گەورەو بەهێزو توانایە ٠ جا ئەوە حەمدە شوکر نیە ٠ وە شوکریش لە حەمد جیا ئەبێتەوە وەك یەکێك بەرامبەر چاکەیێکی خوا سەجدەی سوپاس ئەبات جا ئەوە شوکرە حەمد نیە ٠

**( ووشەی سێیەم مەدح ) :**

مەدح بە ستایشێك ئەڵێن کە بە زوبان بکرێتو

بەس • وە بەرامبەر بە سیفەتێکی چاك بکرێت ، جا ئەو سیفەتە هەر چۆنێك بێت • واتە سیفەتەکە لەدەست سوتایش کراو دابێت یا نا • وە سوودی بگاتە سوتایش کار وەك یەك بڵێ بەخوا فولان پیاوی چاکە ئەو ئیشەی بۆ جێ بەجێ کردم • یاخۆ هیچ نەگاتە سوتایش کار وەك بڵێت بەخوا فولان بەهێزە بنوارە چۆن ئەو شتەی شکاند • هەروا سیفەتەکە لەدەست خۆی نەبێت وەك بڵێی بەخوا فولان قەدو قامەتی چەند جوانە، چونکو جوانی قەدو قامەت مرۆ بەدەست خۆی نیە خوا وای دروست کردووە • جا بۆیە مەدح لە هەردوویان فراوان ترە • بۆ خواش ئەبێت بۆ غەیری خواش ئەبێت وە بەرامبەر هەموو سیفەتێکی چاك ئەبێت ، ئایا سیفەتەکە لە دەست خاوەنی بێت یانە نا ، وە سودێك بگەینێ بە سوپاس کار یانە نا •

## رَبِّ الْعالَمِينَ

واتە ئەو خوایەی کە پەروەردیگاری هەموو بوونە وەرێکە •

### درێژەی واتە :

پەروەردە دوو جۆرە جۆری یەکەم پە روەردەی لەشی ، جا خوا ئەو پەروەردەیەی بۆ هەموو شتێك کردووە واتە دروستی کردووە وە بچمو جۆرو

جوانیو ڕێکو پێکی بە گوێرەی بچمی خۆی پێ بەخشیوە بەتایبەتی بۆ ئادەمیزاد لە هەموو شتێکی جوانتر دروست کردووە و دیتنو بیستنو هێزو تواناو زانینو گوفتاری پێ داوە وە ڕزقو ڕوزیو تەندروستی پێ ئەدات · دووەم ، پەروەردەی خوو ڕەوشتو ڕێگەی ڕاست دانان بۆ ژیان ، وە ئاگادار کردنی ئادەمیزاد لەو شتانە کە زیانن · بۆ ئەوەی مرۆ خۆی لێ بپارێزیت وە لەو شتانەی کە قازانجو بەسوودن بۆ ئەوەی کە مرۆ بیانکات · جا خوا ئەوەشی کردووە وە پێغەمبەری ناردوون وە نامەی پێ داوون کە چاکەو خەراپەیان تێدا دیار کراوە وە ڕەوشتی چاکو بەدی تێدا نوسراوە ، وە کردەوەی بەسوودو بێ سوودو پڕ زیانی تێدا ئاشکرا کراوە· وە پێغەمبەران ئەمەیان بەخەڵك ڕا گەیاندووە وە پاش ئەوانیش زانایان کۆتاییان نەکردووە · وە خەڵکیان لە ڕێگەی خواو ڕەوشتی چاكو بەد گەیاندووە ·

**تێبینی :**

جا لە ( أَلْحَمْدُ لله رَبِّ العالَمِينَ ) دا حەمدو شوکر هاتونە دی چونکو سوپاسی خوایە بەرامبەر ئەو سیفەتە چاکەی کە پەروەردە کردنی خەڵکە بە هەردوو جۆرە پەروەردە ، واتە پەروەردەی لەشیو پەروەردەی خوو ڕەوشتی ·

## ألرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ

واتەی ئەم ئایەتە پیرۆزە لە ( بسم‌الله )دا باس کراوە پێویستی دووپاتی کردنەوەی لێرەدا نیە بەڵام چەند تێبینی‌یەك هەیە پێویستە بی نووسین ٠

یەکەم ئەوەیە کە خـوا پاش ئەوەی کە فەرموی خوا پەروەردیـگاری هــەموو بوونەوەریکــە وە پەروەردەیان ئەکات فەرمــووی ( ألرحمٰن الرحیم ) بۆ ئەوەی بزانین کە خـوا پەروەردەی بوونــەوەر ئەکات بۆ پێویستییێکی نیەوو لەبەر هاندەرێکێ نیە بەلکو بەس لەبەر ئەوەیە کە خوا خاوەن چاکەیە وە حەز لە چاکە کردن ئەکات ٠ وە چاکە کردن سیفەتو ڕەوشتی ئەوە ، بەپێچەوانــەی ئێمە چونــکو هەر شتێکی پەروەردەی ئەکەین بۆیێیە پێویستیمان پێ هەیە وە ئەمانەوێت سوودی لێ وەربگرین ٠

دووەم ، کە فەرمووی پەروەردیگاری بوونەوەرە وە ووتمان یەك لە پەروەردەکانی خوا دانانی ڕێگەی ژیانو دیار کردنی ڕەوشتی چاكو خەراپە ، وناردنی ئایینی ڕاستو دروستە ٠ جا لە پاش ئەوە فەرموی ( ألرحمن الرّحیم ) واتە خوا خاوەن چاکەیە بۆ ئەو کەسانەی کە بەگوێرەی پەروەردەی ئــەو ئەژین وە پەیرەوی ئایینی ئــەو ئەکــەن وە چاکەیان لەگــەڵ ئەکات وە پاداشــیان ئەداتــەوە بە بەخشــینی بەهەشتو دوورخستنیان لە سزاو دوزەخ ٠ وە بۆ

ئەو کەسانەی کە لەرێگەو ڕەوشتو ئایینو پەروەردەی ئەو لا ئەدەن فەرموی ( مالِكِ یومِ الدّینِ ) واتە خاوەنی هەموو ئیشێکە لە ڕۆژی سزادا وە سزا لە هەموو لادەرێكو دەرچوێك لە ڕێگەو ٠ ئایینو پەروەردەی ئەو وەرئەگرێتەوە ٠

کەوابێت ( ألرّحْمٰنْ الرّحیم ) موژدەیە بۆ ئەوانەی پەیرەوی لە ڕێگەو ئایینی خوا ئەکەن ٠وە ( مالك یوم الدین ) هەڕەشەیە بۆ ئەو کەسانە کە لە ڕێگە لائەدەن ٠ دووەم کە ئەفەرموێت ( رب العالمین ألرحمن الرحیم ) ٠

واتە پەروەردەی هەموو شتێك ئەو ئەیکات وە لەبەر چاکەی خۆی ئەو پەروەردە ئەکات جا لەوە دەرئەکەوێت کە هەموو کارێكو ئیشێك لەدونیا وەهەمو قازانجو زیانلە دەست ئەوە،وە کە فەرموی مالك یوم الدین واتە لە ڕۆژی قیامەتیشدا هەموو کارێك لە دەست ئەوە وە هەر ئەو خاوەنی هەموو فەرمانێکە ٠ کەوابێ لە هەردوو جێکە خاوەنی هەموو فەرمانێکە ٠

## ( پرسیارێك )

بۆچ خوا بەس فەرمویەتی خاوەنی هەموو ئیشێکە لە ڕۆژی سزادا ئەدی لە دونیاش ئەو خاوەنی هەموو ئیشێك نیە ، جا بۆچ نەیفەرموو ( مالك یوم الدنیا والدین ) ٠

**وەلام :**

لێرەدا دوو وەلامیان داینـــەوە ، یەکــەم ئەڵێن بۆیە فەرموی خاوەنی هــەموو ئیشــێکە لــە ڕۆژی سزادا چونکو لەوێ هیچ هۆو ئەسباب نامینن • کە مرۆی نەزان وا تێ بگــات کە ئەم ئیشــانە بە هۆی ئەسبابەوە دێنە دی بــەڵکو هەموو شــت بەس بە فەرمانی خوایە بێ سەبەب بەلام لە دونیــادا وا نیە چونکە خوا دونیای بــە جێگەی ئەســباب داناوە وە زۆربەی شت خوا بە ئەســباب بۆ بەنــدە جێ بەجێ ئەکات • جا هەرچەند ســەبەبەکەش خۆی پەیــدای ئەکات بەلام لای خــەڵکی نەزان سەبەب لــە پێش چاوە • جــا خاوەنیەتی خــوا بۆ هەموو ئیشــێك لە قیامەتدا ئاشکراترەو دیار ترە •

دووەم ، لە قیامەت هەموو کەس ئیمــانو بڕوا ئەهێنێ کە هەموو شت لە دەست خوایە • بەلام لــە دونیادا هــەموو کەس ئەو بڕوایــەی نیە چونــکو کافرەکان لایان وایە کــە ئەسباب شــت ئەهێنیتە جێ وە فەرمانی خوا دەخلی نیــە ، جا بــۆیە بەس بۆ قیامەت فەرموی خاوەنی هــەموو ئیشێکە لە ڕۆژی سزا کە قیامەتە •

بەلام من ئەلێم وەلامی ئەم وەلامە وا نیــە بەڵکو ئەڵێم وەك لەپێشاندا ووتمان خوا کە فەرموی ( ربّ العالمین ) واتە پەروەردیگاری هەموو بوونەوەرێــکە وە پەروەردەی هەموو شــت لە دەســت ئەوە ، لە

پەروەردەی لەشـــیو پەروەردە ڕەووشـــتی،وا ئەگە بێنێت کە خاوەنیھەموو ئیشێکەلە دونیادا جا خوا لە ووشەی ( رب العالمـین )دا فەرمووی خـوا خاوەنی هەموو ئیشێکە لە جیهاندا ۰ وە لە (مالك یومالدین) یشدا فەرمووی خاوەنی هەموو ئیشێکە لە قیامەتدا کە وا بێ هەردوکی فەرموونە وە هیچ کامیانی بەجێ نەهێشتووە جا جێگەی ئەم پرسیارە نەما ۰

**تێبینی :**

مرۆ کـە بڕوای هێنـاوە دانی بەمەدا هێنـا وەتێ گەیشت کە هەموو ســوپاسێك بۆ خــوایەو گشت سوپاس بەس شایانی خــوایە چونکو گشت سیفەتی چاکە بەس لە خوا دێتە جێ ۰ وە دانی بەمە دا هێنا کە پەروەردەی هەمووشت لە دەست خوایە پەروەردەی لەشی وە پەروەردەی ڕەووشتیو ئایینی وە خاوەنی هەموو ئیشێکە لە دونیاو خاوەنی چاکەیە بۆ بوونەوەر وە لــە قیامەتیش خــاوەنی هــەموو ئیشێکە ، کە مرۆ ئەمــەی زانی وە تێگەیشـــت وە بڕوای هێناو بەم جۆرە خوای ناسی هــەینێ ئەزانی کە هیچ شتو هیچ کەس شایانی پەرستن نیە جگە لە خوا ۰ وە هیچ کەسو هیچ شت شایانی نیە کە داوای یارمەتی لێ بکـرێت نە بۆ کـاری دونیا نەبۆ کاری ڕۆژی قیامەت ۰ جا لەپاش ئەو تێگەیشتنەو زانینە بێ دەستی خۆی هاوار ئەکـات و ئەڵێت ( ایّاكَ نَعْبُدُ وَایّاكَ نَسْتَعِینُ )واتەبەس تۆ

ئەپەرستین وە بـەس لە تۆ داوای یارمەتی ئەکەین هیچ شتی تر نیە کـە شایانی پەرستن بێـت وە یا شایانی ئەوە بێت کە داوای یارمەتی لێ بکرێت جگە لەتۆ ئەی خوایە ٠

## [ ئاگادار کردنە وەیێك ]

لێرەدا دەلیل پێش داوا خسـترا بۆ ئـەوە کـە داواکەی کرد گورج لـە دل بچەسپێت ٠ وە کـەس نەڵێت بۆچ ٠ وە تووشـی بێ ئەدەبی نەبیت ٠ جـا ماناکەی وا لێدێت ئەگەر هەڵی بسورێنیتەوە خوایە بەس تۆ ئە پەرسـتین وە بەس لەتۆ داوای یارمەتی ئەکەین بۆ هەموو کارێکی دونیاو قیامەتمان چونکو تۆ خاوەنی هـەموو کارێکی لە رۆژی سـەزادا ، وە خاوەن چاکەی بۆ هەموو کەسو پەروەردەی هەموو شت هی لەشیو هی رەووشتی لە دەسـت تۆیە وە تۆ خاوەنی هـەموو کارێکی لە دونیا ، وە کردەوەی چاکە گشتی لـە تۆ دێتە جێ ٠ کەوا بێت هـەر تۆ شایانی پەرستنو شایانی داوای یارمەتی لێ کردنی جا بۆیە بەس تۆ ئە پەرستین وە بـەس لە تۆ داوای یارمەتی ئەکەین ٠

## [ درێژەی واتە ]

[ ایاكَ نَعْبُدُ ] واتە بەس عیبادەتی تۆ ئەکەینو بەس تۆ ئەبەرستین جا با بزانـین مانای عیبادەتو پەرستن جیە ٠

لێرەدا ئەلێین مانای پەرستن‌و عیبادەت بە قسە کردن‌و دواکەوتن‌و پەیڕەوی کردنە ٠

چونکو لە تەفسیری قورطوبی‌دا لە مانای [ ایاك نعبُد ] ئەفەرموێت ، ألْعِبادَةُ ألا طاعَةُ ٠ کەوابێ (ایاك نعبد) واتە بەس پەیرەوی فەرمانی تۆ ئەکەین خوایە ٠

وە لەچەند ئایەتی پیرۆزیش‌دا وا نیشان ئەدات کە ( عیبادەت ) پەیڕەوییە ، خوای مەزن ئەفەرمویت لەسورەتی یاسیندا [ ألَم أعهَد اليكُم يابَني آدَمَ أن لا تَعبُدُوا الشَيطانَ انَّهُ لكم عَدوٌ مُبين ٠ وَأن اعبُدُوني هذا صراط مُستقيم ٠ ] واتە ئەی ئادەمیزادینە ئەدی من پەیمانم لە گەڵ ئێوە نەکرد کە عیبادەتی شەیتان نەکەن چونکو شەیتان بۆ ئێوە دوشمنێکی ئاشکرایە ٠ وە ئەبێ عیبادەتی من بکەن جا ئەوە کە لە عیبادەتی شەیتان لابدەن وە عیبادەتی من بکەن ئەوە ڕێگەیێکە ڕاستەو دروستە وەپێی ئەگەنە قۆناغی خۆش کە بەهەشتەو ڕەزای منە ٠

جا لێرەدا نازانین عیبادەتی خوا مانای چیە ، وە عیبادەتی شەیتان چۆنە ٠ تا نەگەڕێینەوە سەر پەیمانەکە وە بزانین پەیما نەکە چۆنە ئەوجا ئەزانین کە عیبادەتی خوا چۆنە وە عیبادەتی غەیری خوا چۆنە جا پەیمانەکە ئەوەیە کە خوا لە سورەتی بەقەرەدا باس ئەکات وە ئەفەرموێت [ وَقُلْنا ياآدم أسكُن

أنت وزَوجَك الْجَنَّةَ ] واتــه ووتمــان بــه‌ئادەم دانیشه خۆتو خێزانه‌كەت‌له بەهەشت٠[وَكُلا' مِنْها رَغداً حَيْثُ شِئْتُما ] وه بخۆن له میوەو خواردنی بەهەشت به مشەیی چۆن حەز ئه‌كەن ٠ وه له‌كامیان حەز ئه‌كەن ، بــەلام ( وَلا' تقربا هذه الشــَّجَرَةَ فَتَكونا مِنَ الظّالِمِين ) ٠ واتــه نزیــكی ئەم داره مەبن وەلێی مەخۆن چونكه ئەگەر لێی بخۆن واته له ڕێگه‌تان لادا وه به گوناهبار دەر ئەچن ٠

بەڵام ئادەمو حەووا قسەی خوایان جێ هێشــت چونكو ( فَأزَلَّهُما الشَيْطان عَنهــا فَأخرَجَهُما مِمّا كانا فيه ) واته شەیتان بەهۆی داره‌كه زەڵەی به ئادەمو حەووا كرد وه له داره‌كـەیان خوارد ٠ جا خوا دەری كردن لـەو خۆشــیەی كـه تیادابوون (وَقُلْنا آهبطوا بَعضكم لِبعض عَدو ولكم في‌الارض مُسْتَقَرٌ وَمَتاعٌ الى حين ) واته له ئەنجــامدا ووتمان بەشەیتانو ئادەمو حـەووا بڕۆنه خوارێ له بەهەشت هەموتان وه بچۆن بۆ زەمین وه له زەمیندا مانەوەو ژیانتــان بۆ دانراوه تاكــو فەرمانی ڕۆژی قیامەت دێت ٠

جا ئادەم زۆر بەدڵ كزی مایەوه وه هەردەم ئه‌گریا له ترسی خــوا تاكــو ( فَتَلَقّى' آدَمُ مِن رَبِّه كَلِمــاتٍ فَتــابَ عَلَيْه انَّهُ هُوَ التّــوابُ الرَّحيمُ ) جا ئادەم بەكزی مایەوه تاكو خوا چەند ووشەیەكی خسته سەر دڵی ئادەمو حەووا ٠ وه بەم

ووشانه پاڕانەوە جا خـوا تۆبەی لێ گـیرا کـردن وخوا تۆبەی له هـەموو بە ندەیێـك گیرائەكـات ئەگەر تۆبە بكـات ، وە ووشـەكان ئەوەبوون کـه ئادەمو حەووا پێ پاڕانەوە له خوا فەرمویان ( ربنا اننا ظلمنا أنفسنا وان لم تغفر لنا وترحمنا لنكونن من الخاسرين ) واتە خوایە ئێمەخۆمان ستەممان لە خۆمان کرد چونکو له فـەرمانی تۆمان لادا٠وە ئەگەر رەحممان پێ نەکەیت وە لێمان خۆش نەبیت بەڕاستی ئێمە ئەکەوینە ڕیزی بێ بەشان ٠

جا خوا لێیـان خـۆش بوو وە فـەرموی پێیان ( قلنا آهبطوا منها ) ووتمـان بچۆنه خـواریٚ بۆ زەمین ئێـوەو زاوەزەتان ٠ جا لـە زەوییـدا ( فأما يأتينكم منى هدى فمن تبع هـداى فـلا خوف عليهم ولا هم يحزنون ) واتە بچۆنە زەمین وە لەوێدا بەرنامەجو پرۆگرامـو دەستوری ژیانتـان لەلای ئێمە بۆ دیـت ، وە هـەرکەس پەیـڕەوی دەستورو ڕێگەی من بکات هیچ ترسی نایێتە پێش وە هیچ دڵ تەنگیش نابێت بەڵام (والذين كفروا وكذبوا بآياتنا أولئك أصحاب النار هم فيها خالدون ) واتـە هـەر کەس مل پێـچی لە دەستوری ئێمە بکـات ، وە ڕێگەی ئێمە بەراسـت نەزانیت وە دوای ڕێگەیێکی تر بکەویـت ( أولئك أصحاب النار هم فيها خالدون ) ئەوانـە ئەچنـە ئاگر وە ئەوان له ئاگردا ئەمێنن هەتا هەتایی ٠ جـا

لێرەدا دەرکەوت کە پەیمانی خوا ئەوەبوو کەئادەمیزاد دوای فەرمانی خوا بگەوێت وە پەیرەوی فەرمانی خوا بکات وە بەقسەی ئەو بکات • ئەگەرنا پەیرەوی هەر ڕێگەیێك بکات جگە لەڕێکەی خوا واتە دوای شەیتان کەوت وە سەزای دووزەخە •

کەوابێت دەرکەوت کە عیبادەتی خوا بە قسەکردن و پەیرەوی خوایە وە عیبادەتی شەیتان لادانە : لە فەرمانی خوا ، وە هەم خوا لە سورەتی طاهاش‌دا ئەوپەیمانەمان بۆ باس ئەکاوە ئەفەرمۆیت ( فَوَسْوَسَ الَیْهِ الشّیطانُ ) واتە وەسوسەی کرد شەیتان بە ئادەمی ( قال یاآدم هَل أدلُكَ عَلی شَجَرَةِ الْخُلدِ وَمُلك لایَبْلی ) • ئایا پێتان نیشان بدەم ئەو دارەی کە هەرکەس لێی بخوات بە ئەبەدی لە بەهەشتدا ئەمێنی وە ئەبێتە خاوەن دارایێکی‌وا کە قەت تێك ناچێت‌و نابڕێتەوە •

جا ( فأکلا منها ) واتە ئادەم‌و حەووا لە ئەنجامی وەسوەسەی شەیتان خواردیان لەدارەکە [ فبدت لَهُما سوآتهما ] کە خواردیان بەرگی بەهەشتیان لێ داڕناوە شەرمەیان دەرکەوت ( وە طفقا یخصفان علیهما من ورق الجنة ) جا دەستیان پێ‌کرد بەگەڵای داری بەهەشت شەرمەی خۆیان داپۆشی •

( وعصی آدم ربە فغوی ) وە ئادەم بێ فەرمانی خوای کرد وە لە ڕێگە دەرچوو پاشان کە تەوبەی کردو پاڕایەوە خوا لێیان خۆش بوو وە

ئادەمی کردە پێغەمبەر هەر وەك ئەفەرمـوێت ( ثم اجتباه ربّه فتاب عليه وهدى ) واتە پاشان خوا هەڵی بژارد بۆ پێغەمبەرایەتی وە تۆبەی لێ قەبوڵ کرد و خستیە سەر ڕێگەی ڕاست • ئەوجا ( قـالَ اهْبطا مِـنْها جَميعاً ) واتە خوا فەرموی بە ئادەمو حـەووا بچوونە خواری بۆ زەمین هەمووتان ئێوەو زاوەزەتان ( فَاَمّا يَأتِـيَنكم مِني هُدىً فَمَن آتبعَ هداي فلا يَضِـلُ وَلا يَشْقى ) جا لەدواییدا دەستوری منتان بۆ دێت جا هەرکەس پەیرەوی من بکات هیچ گومڕا نابێت وە تووشی زەحمەتو ماندوو بوون نابێت •

جا لەم ئایەتەش دەرکەوت کە خوا ئادەمو حەووای ناردنە زەمین وە پەیمانی وا لەگەڵ کردن کە پەیرەوی فەرمانی ئەو بکەن • جـا پەیرەوی فەرمانی خـواو عیبادەت کردنی خوا یەك شتن • وە هەم لە کاتێکدا کە ئەو ئایەتە دەربارەی جولەکەو دیانان هاتە خوارێ کە ئەفەرموێت ( اتخـذُوا أحْبارَهُم وَرُهْبانَهُم أرباباً مِن دونِ الله ) • واتە جوولەکە مالمەکانیـان کردن بە خوای خۆیان لە جیاتی خـوا • وە دیانەکان قەشەکانیان کردن بە خوای خۆیان لە جیـاتی خوا ، لەو کاتەدا پرسیاریان لە پێغەمبەر کـرد چۆن مالمو قەشەیان کردنە خوای خۆیان لە جیاتی خوا ،حەزرەت دروودی خـوای لەسـەر بێت فەرموی ئـەدی حەلالیان لێ حەڕام نەکردن وە بەقسـەیان کردن ، وە حەرامیان بۆ حەلال نەکردن وە بەقسە یان کردن

ووتیان بەڵێ ، فەرموی کەواتە ئەوانیان کـردن بە خوای خۆیان لە جیاتی خوا ٠

جا لێرەش دەرکەوت کـە مرۆ بە قسـەی هەر کەسێك بکات بێ فەرمانی خـوا ، واتە ئەو کەسەی کردە خوای خۆی لە جیاتی خوا وەعیبـادەتی ئەوی کرد ٠

کە وابێ لێرەشـدا عیبادەت بە قسـە کـردنو پەیرەوی کردنە ٠ وە خـوای مەزن ئەگێریتـەوە لە حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی خـوای لێ بێت کـە بە باوکی خۆی ووت ( يا أبَتِ لا تَعْبُدِ الشَّيطانَ انَّ الشيطان كانَ لِلرَّحمن عَصِيّاً ) واتە ئەی بابە بە

قسەی شەیتان مەکەو پەیرەوی شـەیتان مەکە چونکو شەیتان لەپەیرەوی خـوا درچـووە ٠ جا خۆ باوکی حەزرەتی ئیبراهیم شەیتانی نە ئەپەرسـت بەڵکو بتی ئەپەرست بەڵام چـونکو ئەمە بە قسەی شەیتانو جوان کردنی شـیتان بـوو بە عیبادەتی شەیتان ژماردرا ٠

جا لەم هەموو ئایەتانە دەرکـەوت کە عیبادەت ( پەرستن ) بە مانا پەیرەویو بەقسە کردنە ٠ وە لە چەند ئایەتی تریشدا عیبادەت بە مانای سەجدە بۆ بردنو داوای قازانجو پارێزگاری لـە زیان کردن وە داوای یارمەتی دان هاتووە جا ئەو ئایەتانە ٠

یەکەم ، ئەوەیە کـە خوا لە حـەزرەتی ئیبراهیم

ئەگێریتەوە کە بە باوکی خۆی گوتووە ( یـا أبَتِ لم تَعْبُدُ مـالا یَسمَعُ ولا یُبْصـر ولا یغني عنـك شَیْئاً ) ( آیەتی ٤٢ لە سورةتیمەریەم دا ) ٠

واتە ئەی باوکە بۆ ئەو شـتە ئەپەرسـتیت کە هیچ نابینی وە هیچ سودێکی بۆ تۆ نیە ٠

جا لێرەدا عیبادەتو پەرستن بە مانای سـەجدە بۆ بردنو هاوار کـردنو پاڕانەوەو داوای زـیانو قازانج لێ کردنە ، چونکو باوکی حەزرەتی ئیبراهیم بوتی ئەپەرستن وە بوت قسەی نیە تاکو عیبـادەت بە مانا بە قسە کردن بێت بەلکو سـەجدەی بۆ بت ئەبرد وە لێی ئـەپاڕایـەوە ٠ داوای قازانـج بەخشینو لابردنی زیانی لە بوتەکـان ئەکرد ٠ جـا ئەوەبو عیبادەتی باوکی ئیبراهیم بۆ بوتەکان ٠

دووەم حەزرەتی ئیبراهیم بە باوکو گەلی خۆی ووت ئێوە چی ئەپەرستن ( قالُوا نَعْبُدُ أصْناماً فَنَظلُ لها عاکِفینَ ) ووتیان چەند بوتێك ئەپەرستین وە عیبادەتیـان بۆ ئەکەین ٠ جـا فەرموی ئیبراهیم ( قالَ هل یَسْمَعونکم اذ تَدعونَ ) ئایـا کـە هاواریان ئەکەن هاوارتان ئەبیسن [ أو یَنْفَعونکُم أو یَضُرون ] یـا خۆ سـوودتان پێ ئەگەینن یـا زیانتان لێ ئەدەن ٠ جا لێرەشدا عیبادەت بە مانای دووەمە چونـکو بت قسـەی نیە تاکو بە قسـەی بکرێت ٠

جا کە وابێ پەرستن دوو جۆرە ٠

یەکەم پەیڕەویو بە قسە کردنی فەرمانی یەکێك ۰ دووەم سەجدە بردن بۆ یەکێك ۰ یاشتێك ۰ وە یا بڕوا هێنان بە شتێك ۰ یا کەسێك ۰ کە قازانج بەخشە ۰ وە یا مرۆ لە زیان ڕزگار ئەکات ۰ وە یا ڕزقو ڕوزی ئەدات ، وە یا لە هانای مرۆ دێت ۰ وە یارمەتی مرۆ ئەدات ۰

جا پەرستن بە هەر دوو مانا ئەبێ هەر بۆ خوا بێت وە هەر کات بە هەر مانایێك بۆ غەیری خوا کرا ئەمە پەرستنی غەیری خوایە ۰ واتە هەر کەس دوای کەسێك بکەوێت وە بە قسەی بکات وە پەیرەوی بکات وە فەرمانی بە جێ بێنی بێ فەرمانی خوا ، واتە عیبادەتی غەیری خوای کرد ، وە هەر کەس وا تێ بگات کە غەیریخوا قازانجیپێ بە مرۆ ئەگەیاندرێت وە یا زیانی پێ لێ ئەدرێت وە یا لە غەیبەوە لە هانای دێت وە یارمەتی ئەدات ئەمە عیبادەتی غەیری خوای کرد ۰

جا کە مرۆ ئەڵی ( ایاكَ نَعبد وایاكَ نستعین ) درۆ ئەکات ئەگەر وا نەبێ ۰

جا زۆر کەس لە موسولمانان هەنە کە ڕۆژی حەڤدە جار درۆ لە گەڵ خوا ئەکەن واتە ئەگەر بەس نوێژی فەرز بکەن ۰ بەڵام ئەگەر سوننەتان بکەن ئەمە زیاتر درۆ ئەکەن ۰ چونکو لە نوێژدا ئەڵێت ( ایاكَ نعبد ) واتە خوایە بەس تۆ ئەپەرستین ۰ ( وَاِیّاكَ نَستَعِینُ ) وە یارمەتی بەس لە تۆ داوا

ئەکەین • کــە چی زۆر کەسی تر ئەپەرســتیت وە یارمەتی لە زۆر شتی تر داوا ئەکات ، وە ئەیانکات بە شەریکی خــوا لە پەرســتن‌و داوای یارمەتی لێ کردن دا •

**پرســیار :**

چۆن ئەووترێت کە هەر کەس پەیرەوی کەسێك بکات وە بە قسەی یەکێك بکات وە فەرمانی یەکێك بە جێ بێنیــت ، ئــەمە عیبادەتی غەیری خوای کرد • ئەدی بە قسە کردنی دایکو باوکو مامۆستاو سەردارو برا گــەورەو ••• وە و ••• هتد نابێ بکرێت ، کە وابێ ئەبێ عــالەم هــەمووی کافر بێ‌و عیبادەتی غەیری خوا بکات ؟ •

**وەڵام :**

پەیرەوی‌و بەقسە کردن چەند جۆرێکە • یەکێك پەیرەوی کەسێك ئەکات کە خوا فەرمــانی داوە کە بە قسەی بکرێت ، وە لە ڕێگەیێکی وا کە خوا ئیزنی داوە پەیرەوی ئەکــەیت • وە بۆیە ئەیکــەی چونکو خوا فەرمانی داوە کە بە قســەی بکــەی • جــا ئەو پەیرەوی‌و بە قسە کردنە عیبادەتی خوایەو پاداشتی زۆری هەیە لە لای خــوا • جۆری دووەم ئەوەیە کە خوا فەرمانی نە داوە کــە بە قســەی بکــەیت یا خۆ فەرمانی داوە بە قسەی بکەی بەڵام تۆ لــە ڕێگەیێك بە قسەی ئەکەیت کە خوا ئیزنی لێ نیە • وە ، لــە

بەر فەرمانی خـوا نیە کە بە قسەی ئەکەیت • جـا ئەو جۆرە پەیڕەویانەو بە قسـه کردنە عیبـادەتی غەیری خوایە جا بە وێنە بۆت ڕوون ئەکەمەوە ، تۆ ئەگەر بە قسـەی باوکت یا دایکت ئەکەیت چونکو خوا فەرمانی پێ داوە کە بە قسـەیان بکەی ، وە لە شتی حەلالدا بە قسـەیان ئەکەیت ، ئەمە عیبادەتی خوایە •

بەلآم ئەگەر بۆیە بە قسەی ئەکەیت لە بەر خودی خۆیان نەك لە بەر فەرمانی خـوا ، ئەوە عیبـادەتی غەیری خوایە هەم ئەگەر بە قسەی باوکت ئەکەیت لە ڕێگەی حەڕام وەك فەرمانت پێ ئەدات کـە کافر بێت یا یەکێك بکوژێت بە ناحـەق یاخۆ عارەقی بۆ بێنی بیخواتەوە • یا هەر گوناهێك کە فەرمانت پێ ئەکات ئەوەش عیبادەتی غەیری خوایە • چونکو لـە فەرمانی خوات لادا بۆ فەرمانی باوکت • جا بە قسە کردنی مامۆسـتاو براگەورەو سەرداریش بـەم جۆرەیە ، گەر لە سـەر ڕێگەیخـواو لە حـەلال بە قسەیان بکەیت ، وە چونکو خـوا فەرمـانی بـە مە کردوو ئەمە عیبادەتی خوایە •

وە ئەگەر لە ڕێگەی حـەڕام یا بۆ گونـاه بـە قسەیان ئەکەیت وە بۆ فەرمانی ئەوان لـە فەرمانی خوا لائەدەیت ئەمە جێ هێشتنی عیبادەتی خوایە وە عیبادەتی غەیری خوایە چونکو ( لا طاعَةَ لمَخْلوقٍ في مَعْصِيَةِ الْخالِقِ ) واتە نابێ بە قسەی کەس

بکرێت بۆ شتی گوناه • وه خوا له باسی دایکو باوك ئه‌فه‌رمۆیت ( وَوَصَّيْنا الانْسانَ بِوالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أمُهُ وَهْناً عَلى وَهنٍ وَفِصالَه في عَامَيْنِ أنِ اشكُر لي وَلِوالدَيْكَ اليَّ المْصيرُ )
واته فه‌رمانمان به ئاده‌میزاد کردوه وه پێمان ووتووه چۆن سوپاسی من ئه‌که‌یت واش سوپاسی دایکو باوکت بکه وه پاداشیان بده‌وه ، به تایبه‌تی دایکت که هه‌ڵی گرتی به زه‌حمه‌ت له پاش زه‌حمه‌ت ، وه به دوو ساڵ لێی جیا ئه‌بیته‌وه ، وه هه‌مووتان ئه‌گه‌رێنه‌وه لای من ئه‌گه‌ر چاکه‌ی دایكو باوکتان نه دابێت سزاتان ئه‌ده‌م • پاشان ئه‌فه‌رموێت ( و ان جاهداكَ عَلى ان تُشْرك بي مالَيْسَ لك به علْمُ فَلا تُطعْهُما وَصاحِبهُما في الدّنْيا مَعْروفاً )
واته به‌ڵام ئه‌گه‌ر فه‌رمانیان پێ کردی که هاوتا بۆ من دابنێیت یا کافر بێت یا له ڕێگه‌ی من لا بده‌یت به قسه‌یان مه‌که • به‌ڵام له دونیا هاوڕێییان به خۆشی بکه وه له ڕێگه‌ی من لامه‌ده •

## پرسیارێکی تر :

چۆن ئه‌ڵێی هه‌ر که‌سێ داوای یارمه‌تی له غه‌یری خوا بکات ئه‌مه عیباده‌تی غه‌یری خوای کرد ، ئه‌دی خوا نافه‌رموێت ( وَتَعَاوَنوا عَلى البِرِ وَالتّقْوىٰ وَلاتَعَاوَنوا عَلى الأثْم والعدوانَ )
واته یارمه‌تی یه‌کتر بده‌ن له ڕێگه‌ی چاکه‌و حه‌لاڵو

شتی کە دور بێت لە گوناە • وە ئەو عالەمە گشتی یارمەتی لە یەکتر داوا ئەکات ، جا ئەو عالەمــە چۆن هەمووی عیبادەتی غەیری خوا ئەکات •

وەڵام : لەم ووشــەیەدا دەر ئەکەوێت کــە خوا ئەفەرموێت ( وایاك نستعین ) • واتە خوایە یارمەتی بەس لە تۆ داوا ئەکەین لە هیچ کەسی تر یاشتی تر داوا ناکەین تا بێت یارمــەتی لە غــەیری خــوا داوابکرێت جا گیانەکەم یارمەتی دوو جۆرە •

یەکەم ئەوەیە کە خوا دونیــای دانایە بە جێگەی ئەسباب وە داوای یارمــەتی لە خــەڵك لە ڕێــگەی ئەسبابی ڕێ داوە ، جا ئەوە داوای یارمــەتی کردنە لە خوا چونکو خوا ئەو شــتانەی داناوە وە ئیش پێ کردنی و یارمەتی داوا کردنی لە یەکتر تێدا دروست کردووە • بە مەرجێ وا تێ نەگەی کە ئەو ئەسبابــە شتەکەت بۆ ئەکــات وە یا کــابرای کە لــە ڕێگەی ئەسباب یارمەتێت ئەدات ئەو شــتەت بۆ ئەکات ، بەڵکو وا تێ بگەیت کە خوائەو شتەت بۆ ئەکات وە ئەو ئەسبابەش خوا دایناوە ، وە ئەو کەســەش کە یارمەتیت ئەدات خــوا هــانی داوە • وە دڵی گەرم کردووە بۆ یارمەتی دانت بەڵام ئەگەر واتێ بگەیت کە ئەسباب بەسە بۆ هینانەدی شت وە خوا دەخلێکی نیە • ئەسباب بێ خوا ئیش ئەکات ئەمە شیرکە وە ئەمە داوا کردنی یارمەتییە لە غەیری خوا •

هەر وا ئەگەر وا تێ بگەی کـە ئەوەی یارمەتیت ئەدات • ئەوە شتەکەت بۆ دینیتە دی بێ ی خـوا وە خوا دەخلی نیە ، جا ئەمەش شیرکە وەداوای یارمەتی لە غەیری خوایە •

جۆری دووەم : ئەوەیە کە داوای یارمەتی لە یەکێك بکەیت بە بێ ئەسباب وە لە غەیری ڕێگەی ئەسباب کارێکت بۆ ڕێك بێخیت وەك بت پەرستەکان هاواری سەنەمەکانیان ئەکرد وە داوای منال دانو پاراستن لە زیانیان لێ ئەکـردن ، جا ئەمە شـیرکە وە داوای یارمەتییە لە غەیری خوا،چونکو یارمەتی بێ سەبەب وە یا لە سەرووی ئەسباب بە هیـچ کەس ناکرێت بەس بە خوا ئەکرێت وە یا لە پاشـمندەوە هاواری یەکێك ئەکەیت کە لە هانات بێت وە لەزەحـمەتێك ڕزگارت بکات ، ئەمەش داوای یارمـەتی لە غەیری خوایە چونکو خوا ئەو دەستەلاتەی نەداوە بە غەیری خۆی وە هـەرکەس وا تێ بگات کـە غـەیری خوا ئەو دەستەلاتەی هـەیە واتە شـەریکی بۆ خوا دانا •

جا با بۆ ڕوون کردنەوە چەند وێنەیێکت بۆ بلێم :ـ

یەکەم : یەکێك توشـی نە خۆشـیێك ئەبێت وەئەچێتە لای دکتۆرێك وە دکتۆر تەماشای ئەکات وە ئەلێ ئەم دەردەت هەیە جا دەرمانی ئەداتێ یا خۆ عەمەلیاتی ئەکات وە چاك ئەبیتەوە • ئەگـەر وا تێ بگات کەوا دکتۆر هۆییێکەو خـوا دایناوە • وە خـوا

حستیه دلی کــه نه خۆشــیه‌که چیه • وه کــه عه‌مه‌لییاتی کــرد • یا خــۆ ده‌رمانی پێ دا • وه له ئه‌نجامدا چاك بوو واتێ بگات که عه‌مه‌لییاته‌که وه یا ده‌رمانه‌کان هــۆنه بۆ چاك کــردنه‌وه وه شیفا خوا کردی ئه‌مه موسولمانه وه یارمه‌تی له خــوا داوا کرد نه‌ك له دکتۆرو ده‌رمان •

به‌ڵام ئه‌گه‌ر واتێ بگات دکتــور له‌خۆیه‌وه زانی که ده‌ردی چیه وه به ده‌رمــان چــاك بوو یــا خۆ به عه‌مه‌لییات بێ ده‌خلی خوا ئه‌مه به شــیرك دا ئه‌نرێت وه یارمه‌تی له غه‌یری خوا خواستنه •

چونکو ئه‌گه‌ر خوا شیفا نه‌دات وه مرۆ چاك نه‌کات نه دکتۆر نه هیچ که‌س هیچی پێ ناکرێت جا لێره‌دا دوو چیرۆکت بۆ بنوسم یه‌کێك خۆم دیومه‌و یه‌کێك بیستومه •

یه‌که‌م یه‌کێك جــیرانی ئێمه بوو لــه هــه‌ولێر نه‌خۆشی توش بوو چــووه نه‌خۆشخانه نوست ، سه‌رۆکی خه‌ســته‌خانه ســه‌ر په‌رشتی ئه‌کرد ، وا ده‌رکه‌وت که پێویستی به عه‌مه‌لییاتی ڕیخۆله کوێره هه‌یه • به‌ڕێوه‌بــه‌ری خه‌ســته‌خانه‌و دکتــوره‌کان له سه‌ری کۆ بوونه‌وه وه زگیان‌هه‌ڵبڕی‌و عه‌مه‌لیاتیان کرد نه‌ختێ مــابو کــه ته‌واو بێــت وه زگه‌که‌ی بدروونه‌وه له پڕێکا له سه‌ر عه‌مه‌لیات به‌ریوه‌به‌ری خه‌سته‌خانه ده‌ستی خسته سه‌ر دڵی خۆی ووتی ئای دڵم دێشی دڵم تــه‌قی • ئاگاتان له‌م نه‌خۆشــه بێت

باشی بدروونەوە • بەڕێوەبەرەکە ڕۆییشت لە ئۆدەیەك کەوت تەلەفۆن کرا کە دکتۆری تایبەتیو هەرە باشی دڵیان بۆ داوا کرد لە بەغدا • بە فڕۆکە دکتۆر لە بەغدا بە ڕێ کەوت تا گەییشتە هەولێر بەڕێوەبەرەکە مرد • وە دکتۆرەکانی تریش لەبەر بەڕیوەبەرەکەیا نلە عەمەلیاتی کابرای نەخۆشو زگ دروونەوەی • ماوەیەك بێ خەبەر بوون ، جا لەو ماوەیەشدا نەخۆشەکە مردو بە ڕەحمەتی خوا چوو • جا چونکو خوا ویستی کە بمرێت • دکتورەکانی لێ بێ خەبەر کردن •

دووەم : دکتۆرێك هەبوو هیچ بڕوای بە خواو ئایین نەبوو ، پاش ماوەیەك دیتیان دکتۆر نوێژ ئەکاتو ڕۆژو ئەگرێت وە زۆر باش ڕووی لە خوا کردیە، ووتیان دکتۆر بە چی هاتیە سەر ئەم ڕێگە ؟ ووتی بە دوو نەخۆش • ووتیان چۆن • ووتی دوو نەخۆشیان هێنانە بەر دەستم لە نەخۆشخانە نواندنم • هەر دوکیان یەك نەخۆشیان هەبوو وە لە یەك پلە بوون • لە گەرمیو پاڵەپەستو دڵو هەموو شتێك • وە هەردوکمان لە ئۆدەیەك دانان • وە هەردوکیان چارەو دەرمان کردنو سەر پەرشتی کران • کەچی یەکیکیان مردو یەکێك چاك بو • جا زانستی تەندروستی هیچ تێ نە گەیشت کە بۆچ ئەمە مردو ئەوی تریان چاك بو جا بە مە زانیم کە لە سەرەوەی ئەسباب فەرماندە یەکی تر هەیە ئەگەر

فەرمانی لە سەر بێت ئەسباب کار ئەکات ئەگەر نا هەموو هۆیێك کۆ ببێتەوە بە هیچو بێسوود ئەڕوات ، وە ئەو فەرماندەیە خوای گەورەیە ٠

## وێنەی دووەم :

کابرایێك هەوڵ ئەدات وە هۆو ئەسباب ڕێك ئەخات بۆ ئەوەی کارێك بکات وە سوودی لێ وەر بگرێت ٠ ئەگەر وا تێ بگات کە ئەو هۆیانە وە ئەو کارە سوودەکەی پێ ئەدەن ، ئەمە یارمەتی لە غەیری خوا داوا کردنەو شیرکە وە ئەگەر وا تێبگات کە ئەو هۆیانە بۆ ئەو کارە سەبەبن وە خوا ئەوانەی بۆ ڕێك خستن وە سود بەخش هەر خوایە ، ئەگەر نا هەموو هۆیێك کۆ ببێتەوە بێ‌ی خوا هیچ سوود نادات وە هیچ سوود نایێتە جێ ٠ ئەمە یارمەتی لە خوا داوا کردنە ٠

## چیرۆك :

کابرایێك لە بانقێك ئیشی ئەکرد هەوڵی دا ئیشێك هەبوو زۆر بە سوود بوو وەری گرت کە بە ڕۆژێك تەواوی بکات هەزار دینار وەرگریت ٠ دەستی پێکرد گەیشتە نزیکی کۆتایی٠لە پڕێکەوە زگ ئێشەیەکی توش بوو ، هەڵسا بە یەکێکی ووت نەختێکی زۆر کەمی ماوە تۆ تەواوی بکە هەزار دینارەکەمان بەنیوە ووتی باشە، ئیشەکەی تەسلیمی کابرا کردو ڕۆیشت پاشی دوسێ دەقیقە ئۆدەی

بانق ڕوخا وه کابرای دووەم مرد وه هەزار دینارەکە بۆ هیچیان نەبوو ٠

**وێنەی سێیەم :**

کابرایێك ژن ئەهێنێ وه لەگەڵی ڕێك ئەکەوێت ئەگەر وا تێ بگات کە ژن‌هێنان و لەگەڵ ژن کۆ بوونەوه بەسە بۆ منداڵ بوون ، وه بەم جۆرە ئومێدی منداڵ بوونی هەبێت ئەمە یارمەتی لە غەیری خوا داوا کردنە ٠ وه ئەگەر بڵێ من وا ژنم هێنا وه لەگەڵی ئەنوم ٠ وه ئەمە هۆیە ٠ بەڵام منداڵ بوون بەدەست خوایە ٠ ئەوه داوای یارمەتی لە خوا کرد ٠ وه لە غەیری خوای نەکرد ٠ چونکو ئەگەر خوا منداڵ نەدات سەد ژن بێنیت منداڵی نابێت ٠

**چیرۆك :**

حەزرەتی سولەیمان نەوەدو نۆ ژنی هەبو فەرموی ئەچمە لای گشتیان نەوەدو نۆ کوڕم ئەبێت هەموو لەگەڵم سوار ئەبن بۆ غەزا ، بەڵام لە فکری چوو بڵێ ( انشاء الله ) جا چووه لای گشتیان ٠ هیچیان منداڵیان نەبوو جگە لە یەکێك منداڵێکی بوو بێ دەستو پێو قاچ ٠

جا حەزرەتی (محمد) دروودی خوای لەسەربێ ئەفەرموێت ئەگەر ( ان شاء الله )ی بووتایە نەوەدو نۆ کوڕی ئەبوو وه لەگەڵی سوار ئەبوون ٠ جا خۆ حەزرەتی سولەیمان بڕوای وابوو کەبێ‌ی خوا هیچ

ناکرێت بەس کە بەسەهو ( أن شاء الله )ی نەووت هیچی بۆ نەبوو ٠

**وێنەی چوارەم :**

خوا ئـەفەرموێت [ أفرأيتم ما تحرثون ٠ أأنتم تزرعونه أم نحن الزارعون ٠ لو نشاء لجعلناه حطاماً فظلتم تفكهون٠انا لمغرمون بل نحن محرومون ٠]

ئایا ئەبینن ئەوەی کە ئەیچێنن،ئایا ئێوە شینی ئەکەن‌و ئەی ڕۆێنن یا ئیمە ئەگـەر حـەز بکەین ئەیگێرین بە پووش‌و پەلاشێکی بێ دانـەو پلەو بێ سوود جا دەست بە گفتو گۆ ئەکـەن وە ئەلێن ئێمە زیانمان لێ کەوتووە بەلکو ئێمە بێ بەش کراوین ٠ جا مرۆ کە زەمینی کێلاو تۆی هاویشت وە ئاوی داو پاسی کرد وە ووتی ئەمە سەبەبە ئەگەر خـوا حەز بکات پێ ئەگات وە لێی ئەخۆم وە ئـەگەر نا هیـچ سوودی لێ نابینم ئەمە یارمەتی لە خوا داوا کردنە ٠ بەلام ئەگەر وا تێ بگات‌کەوا کێلایو تۆی هاویشت‌و ئاوی داو پاسی کردو پێویست بە فەرمانی خوا نیە ئەمە یارمەتی لە خوا داوا نەکردنە و گومراییە ٠

**چیرۆك**

کابرایێك ووتی خـوایە من ئـەم زەمینە ئـەکەم بە کشتوکاڵ بە باشی بۆم بێتە پێش نیـوەی بۆمن‌و نیوەی بۆ تۆ،واتە نیوەی ئەکەم بە خـیرو ئەیدەم بە هەژاران ٠

جا هەڵسا کێلای‌و چانـدی‌و داشتی وە پاسـی کرد ٠ جا کشت‌و کاڵەکە وا هاتە پێش هەموو خەڵك لێ سەرسام بوو ٠ کەدروییەوەو خەرمانەکەی حازر بوو تەماشای کـرد نیـوەی گەلێك زۆرە ٠ وە لـە یەیمانی خۆی لە گەڵ خـوا پەشـیمان بوو ، ووتی خوایە تۆ چیت کردووە ، جووتـت لەگەڵ کردووم ؟ یا ئاودێریت لە گەڵ کـردووم ؟ پاسـی‌و دروین‌و گێرەت لە گەڵ کردوم ؟ ( واللە ) دەنکێکت نادەمێ ٠

جا ئەوەندەی پێ نەچو پارچە هەورێك هات کردی بە تەقە تەقو وە لەسەر خەرمانەکەی داڕیژتە باران‌و لێشاو هەڵسا یەك دەنك لەخەرمانەکە نەما ٠ گشتی بەئاودا چوو ٠

پرسیارێك :ــ جا کەوایە ئەبێ ئێمە واز لە ئەسباب بێنین وە ئیش نەکەین ٠

وەڵام : نەخێر برا وا نابێت وە ئیسلام وا ناڵێت بەڵکو ئیسلام ئەڵێت خوا ئەسبابی دروست کردینە وە ژیانی دونیای لەسەر ئەسـباب داناوە وە واجبە مرۆی موسوڵمان ئیش بکات وە لـە دوای ئەسـباب بڕوات ٠ ئەگەر وا نەکات واتە بە پێچەوانەی ئیسلام ئەڕوات‌و ئەژیت، بەڵام بەس ئەوەیە مرۆی موسوڵمان ئەبێ وا تێ بگات کە ئەسباب خوا دروسـتی کردون وە بە ئەسبابی تەنها بەبێ فەرمانی خوا ئیش ناچێتە سەر ، وە خوا ئەتوانی ئەگەر گشت ئەسباب کۆ بن شتەکەت بۆ نەکات‌و نەبێت٠وە ئەتوانێ بێ سەبەب

بۆت بکات • بەڵام ئەم دوو جۆرە کەم ڕوو ئەدات • چونکو عادەتی خوا وایە بەبێ سەبەب شت ناکات وە لە دوای کۆ بوونی ئەسباب شت ئەکات وە ئەو عادەتە تێك نادات مەگەر بیەوێت موعجیزەیێك بێنیتە دی بۆ پێغەمبەرێك وەیا کەرامەتێك بۆ پیاو چاکێك : جا سەبەب پەیدا کردن پێویستە وە واجبە • بەڵام پاش سەبەب ئەبێ ئومێدت بەخوا بێت کە شتەکەت بۆ ببێت نەك بە سەبەب ، وە بزانی سەبەب بێ‌ی خوا هیچی پێ ناکرێت • بەڵام خوا ئەتوانێ بێ سەبەب شت بکات وە ئەتوانێ سەبەب بگورێت وە بە سەبەبێکی‌تر بیکات •

## وێنەی پێنجەم :

یارمەتی داوا کردن لە پیاو چاکان •

با لە پێشدا بزانین کە پیاو چاك کێن • پیاو چاك ئەو کەسەن کە ئیمانو بڕوایێکی پوختو پاكو پتەویان بە خواو پێغەمبەرانو حەزرەتی محمدو ئایینی ئیسلام هەیە ، وە خوا پەرستنیان هەیە واتە ئەوەی واجبە جێ بەجێ ئەکەن وە لە سوننەتانیش کۆتایی ناکەن هەروا لە گوناە خۆیان ئەپارێزن • وە زانان بەوەی کە پێویستە لە ئاینو شەرعی خوای گەورە •

جا ئەو کەسانەن پیاو چاك کە پێیان ئەڵێن وەلی خوا • واتە دۆستی خوا • هەروەك خوا لە قورئانی پیروزدا باسیان ئەکات وە ئەفەرموێت ( ألا انّ أولياء

الله لاخوف" عليهم ولاهم يحزنون ) • واتــه ئەوانەی
اکە دۆستی خـوانە هیچ ترسـیان نایێتە سـەرو
هیچ غەمبارو دڵ تەنگ نابن جا پاشان بۆ ئەوەی کە
بزانین کـە ئـەوانە کێن فـەرموی ( ألَّذينَ آمنوا
وَكانوا يتَقَونَ ) واتە ئەوانە ئەو کەسـانەن کـە
بڕوایان بەخـواو پێغەمبـەرانو نامەکانی خـواو
مەلائیکەو ڕۆژی قیامەتو چـارەنووسی خوا هـەیە
لەگەڵ ئەوەش خۆیان لە گـوناه ئەپارێزن وە ئەوەی
ئیسلامیش واجبی کردووە جێ بەجێ ئەکـەن • جـا
بەگوێرەی ئەم ئایەتە پیرۆزە هەرکەس کە موسولمانە
دۆستی خوایە پیاو چاکـە بەلاّم بەپێی کـردەوەو
دووری لە گـوناه نزمیو بـەرزی پلەیان لە خزمەت
خوا ئەبێت •

جا بەڕاستی دۆستی خواو وەلی ئەو کەسەیە کە
زانایە بـە ئایـین وە بەپێی زاینەکـەی پەیڕەوی
ئەکات واتە ( عالمی عامل ) جا ئەوەیە وەلیو دۆستی
خوا •

جا وەلیو دۆستی خوا سێ حالّی بۆ هەیە •

یەکەم زیندووە • وە لە خزمەتیدای • جـا ئەمە
جۆری داوای یارمەتی لێ کـردنی بەم جۆرەیە کـە
دەرست بدات وە چاکەو خەرابەت تێ بگەیەنێت • وە
لە واجبو حـەڕامو سـوننەتو مەکروهو موباحت
ئاگادار بکات • واتە بەئایین شارەزات بکات •

دووەم نەسحەتت بکاتو بۆ چاکە هانت بدات •

سییەم دوعای بەخێرت بۆ بکات وە داوای دوعای لێ بکەیت ٠

جا ئەو جۆرە داوای یارمەتی کردنە لە پیاو چاك داوای یارمەتییە لە خـوا چونکو خوا خـۆی ئەم پیاو چاکەی بۆ ئەمشتانە داناوە وە فەرمانی بەموسولمانان کردووە کە بچنــە خزمەت ئەو کەســانە وە ڕێگەی ئاینیان لێ پرسیار بکەن وە لێیان فێر ببن ٠ هەر وەك ئەفەرموێت : ( فاسـألو أهل الـذكر ان كنتم لاتعلمون ) ٠ واتە پرسیار لە زانایان بە ئایین بکەن ئەگەر ئێوە خۆتان زانا نین ٠

وە حەزرەتی ( محمد ) دروودی خوای لەسەر بێت فەرمویەتی ( كن عالما أو متعلما أو مسـتمعاً ولاتكن الرابع فتهلك ) واتە خۆت زانا بـە یـاخۆ دەرس وەربگرە لە زاناو فێری ببـە ٠ یاخۆ گوێ بگـرە لە زانایان ٠ وە چوارەم مەبە ٠ نەوەك بەهیلاك ئەچیت، وە هەم خوا فەرمانی بە دوعا داوە کـە دوعا بکەین وە لە خوا بپارێینەوە بۆ مەبەسمان، وەك ئەفەرموێت ( أدعوني أستجب لكم ) واتە داوای مەبەسـتتان لە من بکەن من بۆتان جێ بەجێ ئەکەم ٠ وە فەرمانیشی کردیە کە دوعا بۆ خـەڵك بکەین وەك ئەفەرمـوێت [ وأستغفر لذنبك والمؤمنين والمؤمنات ) واتە داوای لێ خۆش بوون بکە لە خوا بۆ خـۆت و بۆ پیاوەکانی ئیماندارو ژنەکانی ئیماندار ٠ هەم فەرمانی داوە کە موسولمان داوای دوعـا لە یەکتـر بکەن ٠ چونـکو

پێغەمبەر درووودی خوای لەســەر بێت کە حەزرەتی عومەری بۆ چونە عومرە بەڕێ کرد فەرموی ( یا أخيَّ لاتنسنْا نا ) واتە ئەی برا لە لەدوعای خێر لە فکرمان مەکە • وە بە حــەزرەتی ئەبوبەکرو عومەری فەرمو کە چاوتان بە وەیسی قەرەنی کــەوت داوای دوعای خێری لێ بکەن ، جا وا ڕێك کەوت چاویان پێ کەوت وە داوای دوعای خێریان لێ کرد • جــا لێرەدا دیار ئەکات کە گەورەش داوای دوعای چــاکە لە کچکەی خوی ئەکات • چــونکە بێغەمبــر لــە عومەر گەورە تربوو ، وە ئەبوبەکرو عومــەر لە وەیســی قەرەنی گەورە تر بوون •

جا بۆ ئەم دوو شتەو بۆ داوای نەسحەت • خوا ڕێگەی داوە ، وە فەرمانی پێ کــردووە • جا بۆ ئەم سێ شتە لە پیاو چاکی زیندیو حازر داوای یارمەتی بکەیت ئەوە داوای یارمەتی لە خوایە نەك لە غەیری خوا • بەڵام لــەمە زیاتر بۆ هیچ شــتێکی تر داوای یارمەتی لە پیاو چاك دروست نیە وە داوای یارمەتی لە غەیری خوایە و حەڕامە • جا تۆ کە ئەڵێیت بەپیاو چاکێك قوربان هیممەت بفەرمو کــە کوڕەکەم چاك ببیت وە یا نەخۆشیم چاك بیت •• یا ••• یا هتد • ئەگەر مەبەســتت لە هیممــەت ئەوەیە کــە خۆی ئیشەکەت بۆ بکات وە بە ئیرادەو ڕوحانیــەت بۆت جێ بەجێ بکات ئەمە بەتاڵە وە داوا کردنی یارمەتی لە غەیری خوایە ، وە حــەڕامە چونکو جگە لە خــوا

کەس ناتوانێ هــەروا بێ ســەبەبی عادەتی قازانج بەکەس بگەینێت وەیا زیانی لێ بــدات چونکو خوا بۆپێغەمبــەر کە لەهەمــوو پیاوچاکــان گەورە ترو خۆشەویست ترە ئەفەرموێت : [ قل انی لا أملك لکم ضراً ولا رشدا ] واتە بلێ ئەی ( محمد ) بەم خەڵکەمن ناتوانم هیــچ زیانێك بــە کەس بگــەینم وەیا خۆ قازانجێکی پێ بگەینم ٠ چونکو ئەمە کە بێ سەبەبی عادەتی بێت خوا نەیداوەتە بەندە بەلاّم لــە ڕێگەی سەبەب ئەم دەستەلاّتەی پێ داوە بەپێی فەرمــانو ئیرادەی خۆی ، وە ئەگەر مەبەستت وایە کە دوعات بۆ بکات وە لە خوا بپارێیتەوە کــە ئەو شــتەت بۆ بکات ئەمە ڕاستەو دروستە وە یارمەتی لەخوا داوا کردنە نەك لە بەندە ٠

پیاو چاکی لەپاشمندە ( غائب ) ٠

دووەم حاڵ ئەوەیە کە پیاو چــاك لە لات نیە لە پاشمندەیە ، جا لەم حاڵەدا بەس ئەوەندەت بۆ هەیە کە خەبەری بۆ بنێریت کە دوعای خێــرت بۆ بکات ٠ چونکو حازر نیە تاکو داوای دەرســی لێ بکەیت وە یان داوای نەسحەتی لێ بکەیت ٠ بەس ئەوەندە ماوە کە خەبەری بۆ بنێریت کە دوعای خێرت بۆ بکات ٠ بەلاّم هاوار کردنی پیاو چاکان لە پاشمندە حەڕامە وە خوا لە قورئانی پیرۆزدا لە چەند ئایەتدا تەشەنی لەو کەسانە دایە کە هاواری غەیری خــوا ئەکەن ٠ وە ئــەو ئایەتانە زۆربەی من لــە دەنگی دەروون لە

تەفسیری سورەتی نـون ) دا نوسینم وە شـەرحم کردوونە • جا ئەتوانی لەوێ تەماشایان بکەیت هەم ئەتوانی لە ووشـەی ( دعا ، یدعون ، تدعون ) لـە ( مورشد القران الکریم ) ئـەو ئایەتانە بدۆزیەوە وە بزانی کە هاواری غەیری خوا کوفرە •

**پرسـیار : ـ**

بۆچ هاوار کردنی پیاو چـاکان لە پاشـمندەدا حەڕامە • یان کوفرە •

وەڵام : لەبەر ئەوە حەڕامە چونکو تۆ کە هاواری پیاو چاك لە پاشمندە ئەکەیت ئەگەر مەبەستت وایە خۆی دەنگت ئەبیسی وە خۆی ئیشەکەت بۆ ئەکات ئەمە نابێت چـونکو جگە لە خـوا کەس شـتی بێ سـەبەبی عـادەتی بۆ کـەس پێ ناکرێت ، وە ئەوەمان باس کردو ڕابرد •

وە ئەگەر مەبەستت وایە کە دەنگت ئەبیسی وە دوعات بۆ ئەکات ئەمە قەیدی نیە •

بەڵام چۆن دەنگت ئەبیسێ • ئەگـەر وا تێ ئەگەیت کە ئەو پیاوچاکەو زانایە بە هەموو شتێك زانایە وە هەموو دەنگێك ئەبیسی، ئەمە دروست نیە چونکو ئەم سیفەتە هی تایبەتی خـوایە • وە بەندە ئەم سیفەتەی پێ نەدراوە کە هەموو شـت ببیسێ وەیا بزانێت • بەڵی گیانە بۆ پیاو چاکان هەندێ جار هەندێ شـت دەر ئەکـەوێت • وە خـوا بۆیان دەر

ئه خات • وه ئه‌یكات بــه كــه‌ڕامه‌ت بۆیان • به‌ڵام هه‌موو ده‌م وانین‌به‌ڵكو ئه‌مه كه‌م‌كه‌م‌و جار جار بۆیان ڕوو ئه‌دات • هه‌ر وه‌ك حه‌زره‌تی عومه‌ر ڕه‌زای خوای لێ بێت له سه‌ر مینبه‌ری مه‌دینه له‌شكری ساریه‌ی دیت له‌ژێر چیایێك بوو لــه هه‌ماوه‌ند وه ئــه‌گه‌ر كافران چوبانه سه‌ر چیایه‌كه واته له‌شكری ساریه گشتی له‌ناو ئه‌چو ، هــه‌ر له‌وێوه هــاواری كــردو فه‌رموی ( یاسارية ألـْجَـبَـل الجبل ) واته ئه‌ی ساریه ئاگات له چیاكه بێت وه ســاریه ده‌نگه‌كه‌ی عومه‌ری بیست وه گورج چیای قاییم كــرد وه له‌و جه‌نگــه‌دا سه‌ر كه‌وت • جا ئه‌مه بوو به‌كه‌ڕامــه‌ت بۆ عومــه‌ر كه ئه‌و شته‌ی دیت وه بۆ ساریه‌ش كه ئه‌و ده‌نگه‌ی بیست به‌ڵام ئه‌م ئاگاداریه هه‌مو كاتێك نابێت ئه‌دی نابینی حه‌زره‌تی یه‌عقوب یوســفی له‌بــیری كه‌نعان نه‌دیت‌و بێنی كراسیشی نه‌كرد ، كه‌چی له‌میسردا دیتی‌و بێنی كراسه‌كه‌ی كرد • شێخی سه‌عدی له‌م باسه ئه‌فه‌رموێت سوال له یه‌عقوب كرا •

توبویی بیره‌هه‌ن أزمیسر دیدی
چرا دربیری كه‌نعانه‌ش نه‌دیدی •

واته تۆ بێنی كراسی یوسفت له میسره‌وه كرد بۆچ كه له بیری كه‌نعان بوو وه له‌به‌ر ده‌می خۆت بوو نه‌ت دیت •

یەعقوب لە وەلآمدا فەرموی ٠

گەهی بەرو طارومی ئەعلا نوشینم ٠

گەهی بەڕیشتی پایی خود نەبینم ٠

واتە هەندێ کات لە سەرەوەی ئاسمان ئەبینم وە هەندێ کات پشتی پێی خۆم نابینم ٠

وە حەزرەتی ( محمد ) دروودی خوای لەسەر بێ چەند ڕۆژیك حەزرەتی جبریلی لێ وون بوو نەهاتە زیارەتی ٠ پاشان کە هات فەرموی ئەی برام بۆچ وا وون بووی ؟ فەرمووی ئێمە مەلائیکە ناچینە مالێك سەگ یا وێنەی تێدا بن وە سەگێك لە مالی تۆ بوو ٠ خۆی لە ژێر تەختێك وون کردبو ٠ بۆیە نەهاتم ٠ جا ئەو چەند ڕۆژە حەزرەت بەم سەگەی نەزانی ، جا کە پێغەمبەران وابن پیاو چاکان ئەبێ چۆن بن ؟ وە چۆن هەموو شت ئەزانن وەیا خۆ هەموو دەنگ ئەبیسن ٠ ئەمە شتێکە لە بڕوای ئیسلام دانیە وە دوورە لە ئیسلام ٠ وە ئەگەر مەبەست وایە کە خوا دەنگت ئەگەینێ بەو پیاو چاکە ، جا ئەویش دوعات بۆ بکات وە لە خوا بپاڕێتەوە ٠ وە خوا ئیشەکەت بۆ بکات ٠ باشە ٠ بەلآم بۆچ خوا ئەکەیتە بەرید لەبەینی خۆتو پیاو چاکەکە بۆچ هەر یەکسەر شتەکە لە خوا داوا ناکەیت بۆت جێ بەجێ بکات ٠ جا ئەگەر ئەلێی خوا داوای من گیرا ناکات بەلآم داوای پیاو چاکان گیرا ئەکات ئەدی چۆن ئەم

داوایەت گیرائەکات کە دەنگت بگەینێ بە ئـەو پیاو چاکە٠جا کە ئەو داوایەت گیرا ئەکات بۆ ئەوی‌ترت گیرا ناکات ٠ یا کە ئەوی ترت بۆ نەکات بۆچ ئەمەت بۆ ئەکات ٠ جا بەڕاستی شتێکی سەیرە وە لە ژیرو ڕاستی دوورە براکەم ٠

## حاڵی سێیەم پیاوچاکی مردوو :

پیاو چاکی مردوو ئاشکرایە کـە ناتوانی داوای یارمەتی لێ وەربگیرێت ٠ بەم جۆرە کە دەرسـت پێ بدات با نەسحەتت بکات وە هاوار کردنی بۆ ئەوەی خۆی شتت بۆ بکات ٠ بەڵام کـە زیارەتی قەبری ئەکەیت بەگوێـرەی شـەرع وە داوای دوعـای بێ ئەکەیت ئەمە زانایان سێ قسەیان لێ کردیە ٠

یەکەم ئەفەرمون ئەمەش نابێت چـونکو دوعا عیبادەتە وە مرۆ کە مرد لە ئەهلی عیبـادەت نامێنێ وە عیبادەتی بۆ ناکرێت ٠

دوەمیش ئەڵێن نابێـت چونـکو ئەمە یـارانی حەزرەت وە پێشینیان نەیان کـردووە کـە وا بێت بیدعەتە وە هـەموو بیـدعەتێك بەتاڵە وە هـەندێ ئەڵێن دروستە وە مردو عیبادەت ئەکات٠وە ئەتوانی دوعا بۆ خەڵك بکـات ، وەڵام وایە قسـەی سـێیەم ڕاست ترە چونکو پێغەمبـەر لە حەدیسی میعـراج ئەفەرموێت فولان پێغەمبەرم دیت نوێژی ئەکرد وە فولان پێغەمبەرم دیـت نوێـژی ئەکـرد ٠ وە نوێژ عیبادتە جا دیارە مردوو عیبـادەتی بۆ هـەیە ٠ وە

ڕوحی مردو ئاگادارەو خەبەردارە مرۆ کە چووە زیارەتی ئاگادار ئەبێ وە ئەگەر داوای دوعای لێ بکات دوعای بۆ ئەکات ، وە دوعای پیاوچاکان لەحاڵی ژیاندا گیرایە ، کەوابێ لەحاڵی مردن گیرا ترە • چونکو لە حاڵی مردن لە خوا نزیك ترو بەخوا ئاگادار ترن • جا بۆیە زانایان ڕێگەی زیارەتی پیاو چاکانیان داوە بە مەرجێك زیارەتەکە بەگوێرەی شەرع بێت •

**پرسیار :**

زیارەتی بەپێی شەرع بۆ قەبری پیاو چاکان چۆنە ؟

**وەلام :**

زیارەتی قەبران هی پیاوچاکان وەیا هی هەر موسولمانێك بەو جۆرەیە ئەچیتە سەر قەبری وە سەلامی لێ ئەکەیت وە ئەڵێی ( السلام علیکم دار قوم مؤمنین أنتم لنا سابقون ونحن ان شاء الله بکم لاحقون ) واتە سەلامی خواتان لێ بێت ئەی گەلی ئیمانداران ئێوە پێش کەوتون وە ئێمەش پێتان ئەگەین • ئەگەر خوا حەز بکات ( غفر الله للمستقدمین منا والمستأخرین ) خوا لە هەموو لایەك خۆش ببیت ئەوانی پیش کەوتوو پاش کەوتوو • پاشان دوعا بۆ خۆتو بۆ خاوەن قەبرەکە ئەکەیت • وە ئەگەر قورئان بخوێنی بۆی هەدیە ئەکەیت • وە بیر لە قیامەتو زیندوبوونەوەو حیسابی دوای

مردنت ئەکـــەیت ٠ وە داوای دوعای خێر لـــە خاوەنی قەبر ئەکەیت جا جـــگە لەوەندە وەك سور خـــواردن بەدەوری قەبردا یان ماچ کـــردنی دارو بەردو ئاسن هەمووی حەرامـــە ٠ وە ئیمـــامی نەوەوی‌و شـــافعی ئەفەرمون ئەبی کار بەدەست خەڵك لەم جۆرە شتانە قەدەغە بکات‌و لەسەر زانایان فەرزە ئەم شتانە بۆ خەڵك ڕوون بکەنـــەوە وە فێری زیارەتی ڕاســـتیان بکەن چونکو بەڕاستی خـــەڵك زۆر باش لە ڕێگەی شەرعی لاداوە لـــە زیارەتی مەرقـــەدان وە وەك بوت پەرستانیان لێ هاتووە ٠

**پرســـیار :**

بۆچ پێغەمبەر فەرمویەتی کە بڵێین ( ونحن انشاء الله بکم لاحقون ) واتـــە بۆچی ( انشـــاء الله )ی تێ خست ، خۆ ئێمـــە بێ گـــومان ئەمـــرین وە دوایان ئەکەوین لە مردن وە انشاء الله بۆ شـــتێکە گۆمانی لێ بکرێت ٠

**وەڵام :**

بۆیە انشاء اللەی فەرمو چـــونکو تۆ ســـەلام لە ئیمانداران ئەکەیـــت وە ئەڵێی ئێمەش ئەگەینەوە ئێوە وە لەگـــەڵ ئێوە کـــۆ ئەبینـــەوە واتە ئێمەش لەسەر بڕوا ئەمرین وە لە گەڵ گرۆهی ئیمانداران کۆ ئەبین،جا ئەوە جێگەی گومانە چونکو تۆ نازانیت لەسەر چ حاڵ ئەمریت ، زۆر کەس ئیمانداره پاشان

بەبێ ئیمانی ئەڕوات • جا بۆیە ( انشاء الله )ی ئەوێت •

**تێبینی :**

زۆربەی کەسان وا تێ ئەگەن کە عیبادەتو خوا پەرستن بەس نوێژو ڕۆژی و حەجو زەکاتو خێر کردنو سەدەقەو زیکرو تەسبیحاتو تەهلیلەیە • بەڵام ئەمە غەلەتە • وە ئەمانە خوا پەرستنی گیانینە • وە بەمانە گیان پاكو نەرمو گەرم ئەبێت لەسەر بەجێ هینانی فەرمانەکانی خوا وە پەیرەوی ئایینی زاتی بێ هەمتا • وە بەشی تر لە عیبادەت ئەوەیە کە هەرچی حەڕامە لەبەر فەرمانی خوا خۆتی لێ لائەدەیت • جا ئەمە عیبادەتێکی هەرە گەورەیە • وە بەشێکی تر لە عیبادەت ئەوەیە هەر ئێشێك ئەکەیت وە بە هەر کارێك هەڵئەستیت بەپێی فەرمانی خوا بیکەیت وە لە فەرمانی خوا لەم ئیشە لا نەدەیت ، جا ئەمەش عیبادەتە ، جا با لەم بابەتە چەند وێنەیێکت بۆ بڵێم •

یەکێك لە دادگا دانیشتووە داد بەڕێوە ئەبات وە حوکم بەشەرعی خوا ئەکات وە بەرتیل ناخوات وە جیاوازی لە بەینی هەژارو دەولەمەندو بەهێزو بێ هێزو دۆستو بیانیو خزمو ناخزم ناکات ، ئەمە بەعیبادەت حیسابە بۆی ، وە پێغەمبەر (د•خ) ئەفەرموێت ( عدل ساعة خير من عبادة سبعين سنة ) واتە عەدالەتی سەعاتێك لە عیبادەتی حەفتا ساڵ

باشترەو خێر ترە • واتە عیبادەتی سوننەت چونکو واجب ئەبێ هەر بکرێت •

## دووەم :

یەکێك موچە خۆرێکە لــە جێگــەیێك ئیشی بو خەڵك بەڕێوە ئەبات وە جیــاوازی لە بەینی خــەڵك ناکات وە بەرتیل ناخوات وە خەرجی خۆیو منالی ئەم ئیشە جێ بەجێ ئەکات ، ئەمە عیبادەتە مادام واجبی نوێژو ڕۆژی لەسەر ناچوێنی •

## ســێیەم :

یەکێ لە قوتابخانە دەرس ئەدات وە ڕێکەی ڕاست نیشانی منالاَن ئەدات وە فێری خوێندنیــان ئەکات وشتی بێ شەرعیان پێ ناڵێت وە بــەم جۆرە خەرجی خۆیو منالی پەیدا ئەکات ، ئەمــەش عیبــادەتە بۆی بەمەرجێ واجبی ئایینی نەچوێنیو شتی بێ شەرعی بە منالان نەڵێت • وە پێغەمبــەر ئەفەرموێت ( بعثت معلما ) واتە من ناردراوم بە موعەللیم •

## چــوارەم :

یەکێك دوکانی هەیە شت ئەفرۆشــێت • مادام کڕینو فرۆشتن بە گوێرەی شەرع ئەکات وە غەشی تێدا ناکات وە تەرازوو ســوك ناکات وە خیــانەت ناکات و زێدە عــەزافە لە قازانــج ناکات وە واجبی دینی نافەوتێنێ وە حەقی هەژارو بێ دەستەلاَتی لێ ئەدات ئەم ئیشــەی بە عیبــادەت بۆی حیســابەی ئەنوسرێت •

**پێنجەم :**

یەکێك دارتاشە یا ئاسـنگەرە یا بەرگ درووە یا ... یا ... هەر پیشەیێکی ئەیکـات وە غەش‌و خیانەتی تێدا ناکـات وە واجـبی ئایینی لەسـەر ناچوێنی وە بە گوێرەی شـەرع ئەیکات وە خەرجی ماڵ‌و منالی لێ دەر ئەخات ئەم پیشەیە بە عیبـادەت حیسابە بۆی .

**شەشەم :**

یەکێك کشتو کاڵ ئەکات وە یا باخچەچی ئەکات وە بە گوێرەی شەرع ئیش ئەکات ئەمە عیبادەتە . حەزرەت دروودی خوای لەسەر بێت ئەفەرموێت ( ما من مسلم يغرس غرساً أو يزرع زرعا فيأكل منه طير أو انسان او بهيمة الا كان له به صدقه ) واتە هەر مسولمانێك کشـتوکاڵێك وەیـا دارێك ئەچینی جا لەو کشتو کاڵە وە لەو دارە ئاژەڵ یامەل یا ئادەمیزاد ئەخوات ئەمە گشتی بەخێر بۆ ئەنوسرێت .

جا هەروا هەرکەسێك هەرئیشـێك بکات مادام ئیشەکە حەلالە وە بە حەلالی‌و ڕاسـتی‌و بەگوێرەی شەرع ئەیکات ئەمە بە عیبادەت ئەنوسـرێت لەبەر دوو شت .

یەکەم هەموو ئیشـێك فەرزی کیفـایەیە ئەبێ یەکێك یا چەند کەس پێی هەڵسن تاکو پێویستی موسولمانان پێك بێت ، وە فەرزی کیفایەش عیبادەتە وە لە سوننەتان خێر ترە .

دووەم خەرجی ماڵو منال پەیدا کردن واجبە وە مرۆ کە ئیشێك ئەکـات بۆ خۆیو ماڵو منـاڵی واتە ئەمە واجبێکە جێ بەجێی ئەکات وە واجب‌عیبادەتە ٠

**پرســیار :**

قوربان پیاو بەتەنیا نوێژ ئەکات وە یا بە تەنیا فاتیحە ئەخوێنی ٠ جا بۆچ ئەڵێت ( ایاك نعبد وایاك نستعين ) ؟ واتە بەس تۆ ئەپەرستین ، ووشـەی ئەپەرستین ( نعبد ) بە کۆمەڵ بەکـار دینێت ، بۆچ ناڵێت ( اياك أعبد ) تۆ ئەپەرستم ، هەروا لە ( اياك نستعين یش‌دا بڵێت ( اياك أستعين ) ؟

**وەلام :**

ئەوە بۆیـە خـوا وای داناوە تا بزانین کـە موسولمانان هەموو یەکن ، وە قسەی یەکیان قسەی هەمویانە ، وە بەڵێنی یەکێکیان بەڵێنی گشتیانە ٠ وە ئەبێ موسـولمان وابن ٠ وە ئەگـەر وا نەبن بە موسولمانی تەواو ناژمێردرێن ٠جا بۆیە لەشەریعەتی ئیسلامدا لە کاتی جەنگدا ئەگەر سەربازێکی هەرە بچوك ئەمانی دا بە یەکێك لە دوژمن ئەمە بە ئەمان دا ئەنرێت لەلای هەموو موسـولمانانو فەرمانـدەی گشتی ئەبێ ئەو ئەمانە وەربگریت ٠

جا ئەبێت موسولمانەتی ئەوهـا بێت ، ئەوەنـدە یەك بن کە قسەی یەکێك هی هەمویان بێت ٠

جا برا داوای یارمەتی بەس لە خـوا بکـە وە لە کەسی تـرو هیچی تر داوا مەکـە ٠ وە پێغەمبـەر

دروودی خـوای لەسـەر بێت بە عبداللـەی کوڕی عباسی ووت کـە ئامـۆزای خـۆی بو فەرموی

( یاغلام ، انی اعلمك کلمات٠احفظ اللەیحفظك٠ احفظ الله تجده تجاهك ٠ اذا سألت فاسـأل الله ٠ واذا استعنت فاستعن باللـه ٠ واعلم أن الامـة لو اجتمعت علی ان ینفعوك بشیء لم ینفعوك الا بشیء قد کتبه الله لك ٠ وان اجتمعت علی ان یضروك بشیء لم یضروك الا بشیء قد کتبه الله علیك ٠

واتە ئەی کوڕی پێ گەیشتو تۆ ئایینی خـۆ بپارێزە خوا تۆ ئەپایزی ، تۆ ئایینی خوا بپارێزە خوا لە گەڵ تۆ ئەبیت٠وە هەر کات یارمەتیت داوا کرد یارمەتی لە خوا داوا بکە چونکو ئەگەر دانیشتوانی زەمین بە جنوکەو ئادەمیزاد گشـتیان کۆ ببن بۆ ئەوەی کـە قازانجێکت پێ بگەینن ناتوانن کە بۆت بکەن ئەگەر خوا فەرمانی لەسـەر نەبێـت ٠ وە ئەگەر هەمـوو دانیشتوانی زەمین کۆ ببن بە جنوکەو ئادەمیزاد کە زیانت پێ بگەینن ناتـوانن ئەگـەر خـوا فەرمانی لەسەر نەبێت ٠

( اهدنا الصراط المسـتقیم ) واتە بمانخە سەر ڕێگەی ڕاست خوایە ٠

**درێژەی واتە :**

هیدایەت لە زوبانی عارەبیدا بە دوو مانا هاتووە٠ یەکەم بەمانا شارەزا کـردنو نیشـاندانی حـەقو

ڕێگەی ڕاستی . جا خوا ئەو جۆرە هیدایەتەی داوە بە پێغەمبەران وە کردویە بە ئیشی ئەوانو زانایانی ئوممەت بە ئاینو ڕێگەی خودا . جا بەو مانایەیە کە بە پێغەمبەر ئەڵێن هادی . هەروا بەو مانایەیە کە خوا بۆ پێغەمبەر ئەفەرموێت ( وانك لتهدی الی صراط مستقیم ) واتە بەڕاستی تۆ ڕێگەی ڕاست نیشانی خەڵك ئەدەیت . وە شارەزایان ئەکەیت لە ڕاستو چەوتو حەقو بەتاڵو چاكو خەراب .

جا ئەوەی پەیڕەوی پێغەمبەر بکات وە ڕێگەی ئەو بگریت ئەوە دوا قۆناغی بەهەشتەوە ئەوەی بە قسەی پێغەمبەر نەکات وە ئەو ڕێگەیە نەگرێت لە دواییدا لە دوزەخدا ئەبرژێت وە لەوێ ئەمێنی وە ئازار ئەبینی .

مانای دووەم بۆ هیدایەت ئەوەیە کە یەکێك دڵی مرۆ بکاتەوە بیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست . جا ئەو مانایە دەستەڵاتێکی تایبەتی خوایە وە بەکەس نەدراوە بۆیە خوا بە پێغەمبەر ئەفەرموێت ( انك لاتهدی من احببت ولكنَّ الله یهدی من یشاء ) واتە تۆ توانات نیە کە کەس بخەیە سەر ڕێگەی ڕاست با حەزیش بکەیت بەڵکو بەس خوا خەڵك ئەخاتە سەر ڕێگە ئەوەی خۆی حەز بکات وە تۆ بەس ڕێگە نیشاندانت پێ ئەکرێتو لەدەستەلاتی تۆیە . جا داوای هیدایەت بەمانای ڕێگە نیشاندان لە هەموو زانایێکی ئایینی ئەکرێت . بەلام داوای دڵ کردنەوە

و دڵ بۆ حەق وەرگـرتن وە خســتنه ســەر ڕێگەی ڕاستو لە خوا نزیك کردن بە کەس ناکرێت جگە لە خوا وە ئەو دەستەڵاتەی بەهیچ بەندەیێك نەداوە ٠

## الصراط المستقيم

ڕێگەی ڕاست چیە و کام ڕێگەیە ڕێگەی ڕاست ٠

**وەڵام :**

ڕێگەی ڕاست ئەو ڕێگەیە کە خوا لە ســورەتی یاسین دائەفەرمێ ( ألَم أعَـْهَـد اليكم يابـنى آدم ان لاتعبدوا الشيطان انه لكم عدو مبين وان اعبـدونى هذا صراط مستقيم ) واتە ئـەی ئادەمیـزادینە ئێمە پەیمانمان پێ نەدان کـە بەقسەیشەیتانو و پەیرەوی شــەیتان مەکـەن و دوای مەکەون چونکو ئەوە دوژمنێـکی ئاشکرایە بۆ ئـێوە ٠ وە بە قسەی من بکەن پەیرەوی فەرمانی من بکەن وە ڕێگەی ئایینو شــەرعی من بگرن ، جـا ئەوەیـە ڕێگەی ڕاست ٠ هەروا لە سوڕەتی مەریەمیشدا ٠ خوا قسەی حەزرەتی عیسا ســەلامی خـوای لێ بی ئەگێرێتەوە کە بە خــەڵکی ووتــوە وە ئەفەرموێت ( وان الله ربى وربكم فاعبدوه هذا صراط مستقيم ) واتە خوا پەروەردیگاری منو ئێوەیە وە ئـەو ئێمەی هینایتە بون کەوابێ ئـەو بپەرســتن وە لەســەر فەرمانی ئەو بڕۆن ٠ ئەوەیە ڕێگەی ڕاست ٠

جا ڕێگەی ڕاست ڕێگەی خوایە وە ئەویش بریتییە لە قورئانو فەرمایشتەکانی حەزرەت و کردەوەو ڕێگەدانی لەهەر شتێکدا ٠

وە هەر ڕێگەو دەستورێك لەو ڕێگە لابدات وە جیاوازی هەبێت ئەمە ڕێگەی چەوتو ڕێگەی شەیتانە ٠ جا هەرکەس پەیڕەوی قورئانو حەدیسی پێغەمبەر بکات قەت گومڕا نابیت هەروەك حەزرەت لە پێش وەفاتیدا فەرموی ) انی تارك فیكم ما ان تمسكتم به لن تضلوا أبدا كتاب الله وسنتي ) واتە من کە مردم بۆ ئێوە بەجێ دێلم دوو شت ئەگەر پەیڕەوی بکەن قەت گومڕا نابن ٠ وە ئەو دوو شتە یەکیان کتێبی خوایە کە قورئانەو ئەوی تریان ڕەووشتی منە ، جا هەر کەس لەو دوو شتە لا بدات گومڕاو ڕێگە لێ گۆڕاوە ئەگەر بەباڵیش بفرێت ٠

## دوو پرسیاری تر :ـ

یەکەم ئەو دوعایە واتە ( اهدنا الصراط المستقيم ) موسولمانان ئەی خوێنن هەروەها یارانی حەزرەت و حەزرەتیش بەخۆی ئەم دوعا یەیان لە نوێژدا خوێندووە ٠ جا بۆ ئەمە ئەخوێنن ئەدی هەمویان لە سەر ڕێگەی ڕاست نینە کە ئیسلامە ٠

لێرەدا دوو وەڵام هەن ٠

یەکەم ئەوەیە کە ( اهدنا الصراط المستقيم ) بۆ ئەو کەسانەی کە لەسەر ڕێگەی ڕاستن مانای وایە

خوایه بمان هێڵەوە لەسەر ڕێگەی ڕاســت وە لێمان نەگۆڕیت وە لامان نەدەیــت لەســـەر ئەم ڕیگەیە کە ئیسلامە جـا ئەوە وەك ئــەوە وایە کــە یەکێك ڕاوەســتاوە پێی ئەڵێیــت ڕاوەستە واتە لەســـەر ڕاوەستا نەکەت بەردەوام بە وە دامەنیشە ٠

دووەم وەڵام ئەوەیە کە پلەی ڕیگەی ڕاستو خوا ناسینو خــوا پەرســتن زۆرن ئەگەر مرۆ لەهــەر پلەیێك دا بێت لــەم پلەیە بەرزتر هەیە ٠ جا هــەر کەس کە ئەڵێت ( اهدنا الصــراط المســتقیم ) واتە خوایە بمانخە سەر پلەی بەرز تر لە ڕێگەی ڕاستدا، وە ئەیەوێ لە پلەی خۆی بەرەو ژوور تر بچێت ٠

لەبەر ئەمە حەزرەت دروودی خوای لەسەر بیت ئەفەرموێت ( سبحانك ماعرفناك حقّ معرفتك ) واتە گەوریی‌و پاکی بۆ تۆیە خوایە ئێمە تۆمان نەناسیوە بە تەمامی ناسین ٠

هەروا ئەفەرموێت ( ســبحانك ماعبدناك حقّ عبادتك ) واتە تۆمــان نەپەرســتیە بە تــەواوی پەرستنت ٠

پرسیاری دووەم مرۆ کە خۆی تەنها نوێژ ئەکات یاخۆ فاتیحە ئەخوێنێ بۆچ ئەبێ بڵێت ( اهدنا ) واتە بمانخە سەر ڕێگەی ڕاست ٠ بۆچ ناڵێت ( اهدنی ) واتە من بخە سەر ڕێگەی ڕاست ٠ ئەدی بەس خۆی نیە وە تەنها نیە ؟

وەڵام :ــ ئەمە بۆیێە کە خوا موسولمانان دەرس

ئەدات کە دوعا ئەکەن بەس بۆ خۆ نەکەن بەلکو بەگشتی بۆ هەموو موسولمانان بکەن • جا کە ئەلێت ( اهدنا ) واتە ئێمەو موسولمانان گشتمان بخە سەر ڕێگەی ڕاست •

چونکو پیاو ئەگەر بەس بۆ خۆی دوعا بکات ئەمە بو خلە • وە بوخل سیفەتێکی خەرابە ئەبێ مرۆ خۆی لێ بپارێزی • وە ئەگەر بەس بۆ خەلکی دوعا بکات وە بۆ خۆی نەکات ئەمەش خود پەسندییە • وە ئەویش سیفەتیکی بەدە وە نابێ موسولمان هەیبێت• جا موسولمان کە دوعا ئەکات ئەبێ بۆ خۆیو دایكو باوکیو هەموو موسولمانان بکات ، هەر وەك خوا ئەو ڕەوشتەمان نیشان ئەدات وە ئەفەرموێت ( واستغفر لذنبك وللمؤمنين والمؤمنات ) واتە داوای لێ خۆش بون بکە بۆ خۆتو هەموو ئیمانداری پیاوو هەموو ئیمانداری ژن •

وە حەزرەتی نوح کە دوعای کرد فەرموی ( رب اغفر لی ولوالدی ولمن دخل بیتی مؤمنا وللمؤمنين والمؤمنات ولا تزد الظالمين الا تبارا ) واتە خوایە لەمن خۆش ببە وە لە دایكو باوکمو هەر کەس کە هاتونە ماڵم بە ئیمانەوە وە لەهەموو ئیمانداری پیاوو هەموو ئیمانداری ژن خۆشبە وە بۆ کافران زێدە مەکە جگە لە تون بەتون چونیانو ە لەناو چونیان •

جا برا کەم ئەوەیە ڕەوشتی قورئان لە دوعا کردندا وە ئەبێ لەسەر ئەم ڕەووشتە بڕۆین جا

ئەوەش دەرسێکی تری تیدایە بۆ موسلمانان • واتە ئەبێ موسولمان هەرچی بۆ خۆی حەز لێ ئەکاتو داوا ئەکات بۆ هەموو موسولمانانیش حـەزی لێ بکاتو داوای بکات ، وە هەرچی بۆ خۆی پێ ناخۆشە ئەبێ بۆ هەموو موســولمانانیشی پێ ناخــۆش بێت • وە قازانجی موسولمانان بەهی خۆی بزانێت وە زیانیان بە زیانی خــۆ دانێت ،ئەوجا ئەبێتە موســولمانێکی تەواوو پوختو پتــەوو ڕاست • هەروەك حــەزرەت ئەفەرموێت ( لایؤمن احدکم حتی یحــب لاخیه مایحب لنفسه ) •

واتە ئیمانتان پتەو نابێت تاکو واتان لێ نێت کە ئەوەی بۆ خۆت پێ خۆشە بۆ برای موســلمانیشت پێ خۆش بیــت ، وە ئەوەی بۆ خۆت پێ ناخۆشــە بۆ برای موسولمانیشت پێ ناخۆش بێت وە حەزی لێ لێ نەکەیت •

جا ئەبێ موسولمانان وابن وە ئەگەر وا نەبن بە موسولمانی تەواو ناژمرێن • جا بەداخەوە موسلمانان لەم ڕێگەیان لادا بۆیە بوینە ژێر دەســتو چەپۆکی بێگانە • وە پەستو زەبون بوین لە ئەنجــامی لادان لە ڕێگەی برایــەتی گشــتی • وە کــەوتنە ڕێگەی بەربەرەکانی یەکتر • جا خوا چارەمان بکات آمین •

## صِراطَ الّذینَ أنعَمْتَ عَلَیْهم

واتە بمانخە سەر ڕێگەی ئەو کەسانە کە چاکەت لە گەڵ کردوون •

## درێژەی وانە :

جا خوا دیاری کرد کە ڕێگەی ڕاست کە ئیسلامە ڕێگەی ئەو کەسانەیە کە خوا چاکەی لەگەڵ کردوون. وە فەرموی ڕێگەی ئەو کەسانە کە چاکەت لەگەڵ کردوون خوایە.

جا با بزانین ئەوانەی خوا چاکەی لەگەڵ کردوون کێن. ئەوانە خوای مەزن لە ئایەتی ٦٩ لە سورەتی نیساءدا باسیان ئەکات وە ئەفەرموێت ( ومن يطع الله والرسول فأولئك مع الذين أنعَم الله عليهم من النبيّين والصديقين والشهداء والصالحين وحسن أولئك رفيقا ) واتە هەر کەس پەیرەوی خواو پێغەمبەری خوا بکات وە لە سەر فەرمانیان بڕواتو بژیت ئەوانە لە بەهەشتدا لەگەڵ ئەو کەسانەدا ئەبن کە خوا چاکەی لەگەڵ کردوون. وە ئەوانەش پێغەمبەرانو صدیقو شەهیدو پیاوچاکن. وە چەند خۆشو جوانە هاوڕێو هاوجێی ئەو کەسانە.

جا هەر کەس لەسەر ڕێگەی خواو پێغەمبەر بڕوا وە بەفەرمانی ئەوان ئیش بکات و بژێت بزانە کە ئەم کەسە خوا چاکەی لەگەڵ کردووە وە هاوڕێی پێغەمبەرانو صددیقانو شەهیدانو پیاو چاکانە لە بەهەشتدا.

جا خوا بەچاکەی خۆی ئەو پلەمان پێ ببەخشێت، آمین.

[ غير المغضوب عليهم ولا الضالين ] ٠

واته نەمانخەیە سەر ڕێگەی ئەو کەسانەی کە غەزەبیان لێ گیراوە لە خزمەت تۆ خودایە وە نەشمانخەیە سەر ڕێگەی گومڕایان ٠

**درێژەی واتە :**

غەزەب لێ گیراو کێن و گومڕا کێن ٠ ئیمامی ڕازی ئەفەرموێت هەندێ ئەڵێن غەزەب لێ گیراو جوولەکەن وە گومڕاش دیانەکانن وە ئەفەرموێت بەڵام ئەم قسەیە زەعیفە واتە ئەو حەدیسەش کە بەم جۆرە باس ئەفەرموێت زەعیفە چونکو بت پەرستەکان خۆ لەوان خەرابترن بۆ ئەوان غەزەب لێ گیراو نینە ، جا لێرەدا ئێمە ئەڵێین حەززەت کە فەرمویە غەزەب لێ گیراو جوولەکەن وە گومڕا دیانن ٠ خۆ مانای وانیە بەس ئەوانن وە کەسی تر غەزەب لێ گیراو وگومڕا نینە٠ تابت پەرستەکان لێ بچنە دەرێ بەڵکو ئەوە ئەگەینێ کە جوولەکە غەزەب لێ گیراون وە دیانیش گومڕانە ٠ جا خەڵکی تریش گومڕاوو غەزەب لێ گیراو هەنەو زۆرن بەڵام حەززەت باسی نەفەرمون ٠ وە خۆی ئەزانیت بۆچ باسی نەفەرمون بەڵام من وا تێ ئەگەم بۆیە بەس ئەو دوو چینەی فەرمون چونکو ئەمەی لە کاتێکدا فەرموو کە ئەوەی بەربەرەکانی ئیسلامی ئەکرد بەس جوولەکەو دیبان بوون چونکو بت پەرستەکان موسوڵمان بوبون ٠

جا ئیمامی ڕازی زۆر مانای تریش لە زانایان نەقل ئەکات بەڵام دڵ بە هیچیان تێر ئاو نابێت • جـا من لام وایە کە غەزەب لێ گیراو کەسـێکە کـە ئەزانی ڕێگەی ڕاست کامە وە ئیسلام ڕاستەو حەقە ، بەڵام بەس لەبەر دەم بڵندی یا کەلکو سـودی دونیـا وەرگرتن لـە بەتاڵ پەرسـتن • ئیمـان ناهێنی وە موسوڵمان نابێت • بەڵام گـومڕا ئەوەیە کە لە نەزانی موسوڵمان نابێت ، هـەروا کەسـێك خەڵك ڕائەکێشێتو بانگ ئەکات بۆ ڕێگەی بەتاڵ • ئەوە غەزەب لێ گێـراوە • وە ئـەوەی لـە نەزانی دوای ئەکەوێت گومڕایە • جـا گوناهی گـەورە بۆ پێش ڕەوە وە خەڵکی تر بەستەزمانو نەزانە • خوا لامان دات لە غەزەب لێ گیراویو گومڕایی •

## ( واتەی تەحیات )

چونکو فاتیحەو تەحیات پێکەوە ئەخویندرێن لە نوێژدا پێویستە تەحیاتیشت‌بۆ بنووسم وە ماناشی بکەم ٠

التحيات لله ، السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته ٠ السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين ٠ أشهد أن لا اله الا الله ٠ وأشهد أنّ محمداً رسول الله ٠ اللهم صل علىٰ محمد ٠

**واتەی ووشەکان :**

( التحيات ) هەموو ڕێزو گەورەیی ٠
( لله ) بۆ خوایە ٠
( السلام عليك ) ڕەحمەتی خوات لەسەر بێت ٠
( ايها النبي ) ای پێغەمبەری خوا ٠
( ورحمة الله ) هەم ڕەحمەتی خواشت لەسەر بێت ٠
( وبركاته ) پیت‌و فەڕو بەرزی خواشت بە سەردا بڕژێت ٠
( السلام علينا ) ڕەحمەتی خوا لەسەر ئێمەش بێت ٠
( وعلى عباد الله ) هەم لەسەر بەندەکانی خواش بێت ٠
( الصالحين ) ئەو بەندانە کەڕێ ڕاگرو ڕێ ڕاستن ٠

( أشهد ) شاهیدی ئەدەم ·
( أن لا اله ) هیچ کەس وهیچ شت شایانی پەرستن نیە ·
( الاّ الله ) جگە لە خوای مەزنو تاكو تەنیا ·
( واشهد ) هەمشاهیدی ئەدەم
( أنَ محمداً ) كە ( محمد ) ·
( رسول الله ) پێغەمبەری خوایەو ڕابەری ڕێگەی ڕاستو حەقە ·
( اللهمّ صلّ ) خوایە ڕەحمەتت بڕێژە ·
( علی محمد ) بۆسەر ( محمد ) کە پێغەمبەری تۆیە ·
جا لە دانیشتنێکی کە سەلامی لێ نەدرێتەوە بەس ئەوەندە لە تەحیات ئەخوێندرێت · وەك دانیشتنی یەکەمی نیوەڕۆو ئیوارەو شیوانو خەوتنان ·
بەڵام بۆ دانیشتنی کە سەلامی لێ ئەدرێتەوە وەك دانیشتنیسبەینەو دانیشتنی دووەمی نیوەڕۆو ئێوارەو شیوانو خەوتنان ئەوەش زێدە ئەکرێت ( وعلی آل محمد ) واتە خوایە هەم ڕەحمەتت بڕێژە سەر ئالی محمد · جا زێدە کردنی ئەمە لای هەندێ زانایان واجبە وە لەلای هەندێکیان سونەتە هەروەها سونەتە ئەوەش زێدە بکات ( کما صلیت علی ابراهیم وعلی آل ابراهیم · وبارك علی محمد وعلی آل محمد کما بارکت علی ابراهیم وعلی آل ابراهیم انك حمید مجید ) واتە خوایە هەروا ڕەحمەتت

برِێژە بەسەر ئیبراهیم • وە بۆ سەر ئالی ئیبراهیم وە هەم بەرەکەتت برِێژە سەر محمد وەهەم سەر ئیبراهیمو ئالی ئیبراهیم • خوایە تۆ پەسندو بەرِێزو گەورەی •

## ( پوختەی واتەی تەحیات )

هەموو گەورەییەك بۆ خوایە • رەحمەتی خوات لێ بێ ئەی پێغەمبەر • رەحمەتی خوای لە ئێمەو لە هەموو بەندە باشەکانی خوا بێت • خوایە رەحمەتت برِێژە سەر محمدو ئالی محمد •

هەروا رەحمەتت برِێژە سەر ئیبراهیمو ئالی ئیبراهیم وە بەرەکەتت برِێژە سەر محمدو ئالی محمد • وە • بەرەکەتت برِێژە سەر ئیبراهیم و ئالی ئیبراهیم • بەراستی تۆ خودایە پەسندو بەرِێزو گەورەی • وە لەپاش ئەوە مرۆ کەیفی خۆیەتی چەندی دوعا بۆ خۆیو بو موسولمانان ئەخوێنێتو هەم کەیفی خۆیەتی هەر دوعایێك ئەکات مادام داوای حەرامی تێدا نەبێ •

بەلام ئەم دوعا نەی کە لە قورئاندانە یاخۆ لە پێغەمبەر بیستراوون باشترن کە بیان خوێنێ •

**پسیار :**

ئالی محمد کێنە کە سەلەواتیان لە سەر ئەدرێت ؟

**وەلام :**

زۆر کەس نازانی کە ئالی محمد کێنە وە زۆر

کەسیش وا تێ ئەگات کە ئالی محمد نەتەوەی حەزرەتی فاطیمەنەو بەس • بەڵام ئەمە هەڵەیێکی زلە • چونکو لەباسی ئەمە کە ئالی محمد کێنە زانایانی ئیسلام چەند قسەیان کردووەوە ئەو چەند قسەیە ئەمەتەن کە •

( ابن القیم الجوزی ) لە کتێبی ( جلاء الافهام في الصلاة والسلام علی خیر الانام ) دا ئەفەرموێت زانایانی ئیسلام لەمانای ئالی محمد کە کێنە بوینە چوار چین • چینی یەکەمیان ئەفەرمون ئالی محمد ئەو کەسەن کە زەکاتیان پێ ناشێت وە لێیان حەرامە وە نابێ بیان درێتێ وە نابێ وەر بگرن • جا ئەو چینەشی بوینە سێ قسە • یەکەم ئەفەرموێت ئەوانە بریتینە لە نەتەوەی هاشمی باپیری بابی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت • هەروەها نەتەوەی ( مطلب ) جا هەر کەس بگەرێتەوە سەر ( هاشم ) وەیا ( مطلب ) ئەمانە ئالن جا ئەمە بڕیاری ئیمامی شافعیو ڕیوایەتێکە لە ئیمامی ئەحمەد ڕەزای خوایان لێ بێت وە لە ئێمەش بێت •

جا لەم قسەیەدا ئال بەس نەتەوەی حەزرەتی فاطیمە نەبوون •

دووەم قسە ئەفەرمون کە ئال بەس ئەوانەن کە ئەگەڕێنەوە سەر ( هاشم ) وە ئەوانەی ئەگەڕێنەوە سەر (مطلب) ئال نینە • وە ئەم قسەش بڕیاری ئیمامی حەنەفیو ڕیوایەتێکە لە ئەحمەد •

هەروا ( ابن القاسم ) کە هاوڕێی ئیمـامی مالیکە ٠ ئەو بڕیارەی پەسند کردووە ٠ ڕەزای خوای لەوانو لە ئێمەش بێت ٠٠ وە لێرەشدا هەرچی لە (هاشم) بێت ئالە ٠

قسەی سێیەم ئەفەرمون ، هەر کەسێك بگاتەوە سەر غالب لەقورەیشـیان ئەمە ئالی (محـمد)ە جا نەتەوەی (هاشم)و (مطلـب)و نوفل و أمیە هــەموو ئالن ٠ واتە هەر کەس لە نەتەوەی غـالب بێـت کە باپیرێـکی بەرەژووری (محمد)ە گشـتیان ئـالی (محمد)ن ٠ وە ئەوەش بڕیاری هەندێ لە مالیکیانە ٠ وە لەم قسەیەدا ئال گەلەك زۆرن ٠

چینی دووەم ئەفەرموێت کە ئالی محمد خێزانەکانی پێغەمبـەرو نەتەوەی پێغەمبـەرن دروودی خـوای لەسەر بێت بەلام ئەو قسە زۆر زەعیفە چینی سێیەم ئەفەرموێت هــەر کــەس ئوممــەتی بیغەمبـەرە وەپەیرەوی پێغەمبەر ئەکات و بڕوای پێ هێناوە تـا قیامەت ئەوە ئالی (محمد)ن چونکو ئـال بەمـانا دوا کەوتوو پەیڕەوی کـردەیە ٠ وە ئـەو قسـە زۆر بەهێزە ٠

وە قسەی هەندێ لە زانایانی شافیعی و ئیمامی نەوەویو شێخی طەبەریو شێخی ئەزهەرییە ٠

چینی چوارەم ئەفەرمـون ئالی ( محمـد ) ئەو پیـاو چاکانەن لە ئوممـەتی (محمـد) کە خۆیان لە گوناه ئەپارێزن ٠

جا ئەمە چەند قســەیەکن لە زانایانی ئیســلام وەرگیراون • وە لەم چەند قسەیە زیاتر نیە • وە لە هیچ قسەیێکدا ئەوە نیە کە ئالی محمد بەس ئەوانەن کە نەتەوەی حەزەرەتی فاطیمە بن ، رەزای خوای لێ بێت • بەلکو نەتەوەی حــەزرەتی فاطیمــە کە ئالن بۆیی نیە کە لە فاطیمــەن بەلکو لەبــەر ئەوەیە کە ئەگەرێنەوە سەر (هاشم) • وە نەتەوەی هاشیمن • واتە ئەوە جیاوازیێك نیــە کە درابێت بە حــەزرەتی فاطیمە وەك چەند خەلك وا تێ ئەگات •

جا ئەم چوار چینە زانایانە هەر کەس بەلگــەو دەلیلی لەسەر قسەی خۆی هێناوەتەوە • وە ناتوانین لێرەدا بەلگەکانیــان بلێین ، بــەلام من ئەلێم ئــالی محمد لە دوو جێگەدا باس کــراوە یەکەم لەبــاسی زەکات کە حەزرەت ئەفەرموێت ( انها لاتحل لمحمــد ولا لآل محمد ان لکم فی خمس الخمس مایکفیــکم او یغنیکم ) واتە زەکات حــەڕامەو قەدەغەیە لەسەر (محمد) و ئالی (محمد) واتە خزمەکانی محمد دروست نیە بیخۆن وە پێیان بــدرێت • وە ئال لــە ( خمس الخمس ) ئەوەندەیان هەیە کە بەشیان بکات ، بەلکو دەولەمەندیان بکات جا ئەوە جێگەی قسە نیە بەلکو ئەبێ تەماشای کتێبی مێژوو ژیانی حەزرەت بکرێت ئەوجا بزانین کە حەزرەت (خمس الخمس) بەکامیان داوە ئەوە ئالن • وە زەکاتیان پێ ناشێت • جێگەی دووەم : کە باســی ئال کــراوە ئەوەیە لــەباسی

سەلاوات باس کراوە لەو کاتە کە ئایەتی خوا هات کە ئەفەرموێت ( ان اللە وملائکتە یصلون علی النبی . یا ایها الذین آمنوا صلوا علیە وسلموا تسلیما ) . جا لە حەزرەتیان پرسی ئێمە ئەزانین کە سەلام چۆن لەتۆ ئەکەین بەلآم نازانین کە چۆن سەلاوات لەتۆ بدەین . فەرموی قولوا ( اللهم صل علی محمد وعلی آل محمد ) واتە خوایە ڕەحمەتت بڕێژە سەر محمدو سەر ئالی محمد .

جا لێرەدا ئەبێ بزانین کە ئالی محمد کێنە کە سەلاواتیان لەسەر ئەدرێت .

وە قسەی ڕاست لێرەدا ئەوەیە کە ئالی محمد ئەو کەسانەن کە پەیڕەوی ڕێگەو ئایینی محمد ئەکەن . جا جیاوازی نیە لە نەتەوەی حەزرەتی فاطیمە بن یاخۆ لە نەتەوەی یەکێکی تر بن ، چ ئەفغانی بن چ ئەفریقی . بە جۆرێکی وا ئەگەر یەکێك لە نەتەوەی حەزرەتی فاطیمە بێت وە پەیرەوی لە ڕێگەی محمد نەکات بە ئالی محمد حیساب نیە . بەلآم بێ یا ئەفغانیو پەیرەوی ڕێگەی یەکێکی هنیدی پێغەمبەر (د . ج) بکات ئەمە ئالی (محمد) ە دروودی خوای لەسەر بیت . چونکو ئالی محمد بە مانای پەیرەوی کردەو دوا کەوتوی ( محمد )ە .

جا ئەم قسەیە بە چەند بەلگەیێك دەرئەکەوێت وە ئیسپات ئەبێت .

یەکەم حەزرەتی محمد دروودی خوای لەسەر

بێت فەرمویەتی ( آل محمد کل تقی ونقی ) واتە ئالی (محمد) هەموو کەسێکە کە پارێز لە گوناه ئەکات و پاکە لە کوفرو بێ بڕوایی ٠

دووەم : خوا لە قورئانی پیرۆزدا باس ئەکات وە ئەفەرموێت ( ونادی نوح ربّه ) واتە نـوح هاواری خوای کرد بۆ کورەکەی وە فەرموی ( فَقَالَ رَبِّ ان آبنْي مِن أهْلي ) ووتی خوایە کوڕەکەم لە ئەهلی منە ( وَانَّ وَعْدكَ الحَقُّ ) وە بەڕاستی بەڵێنی تۆ کە فەرموتە هەر کەس لە ئەهلی تۆ بێت ڕزگاری ئەکەم ڕاستە ٠ (وَأنتَ أحْكَم الحاكمِينَ ) وە تۆ لە هەموو حاکمان حاکم تری وە کەیفی خۆتە ٠ جـا خوا وەڵامی نوحی داوە فەرموی ( قالَ یانُوح انَّه لَيْس مِنَ أهْلـكَ ) ووتی ئەی نـوح کوڕەکەت ئەهلی تۆ نیە چونکو ( انَّه عَمَل غَيُر صالح ) خاوەنی کردەوەی ناپاكو بەدە٠جا نابینی کە کوری نوح بە ئالو ئەهلی نوح دانەنـراو ٠ لە گەڵ کافرانـدا خنکا چونـکو پەیڕەوی باوکی نەکرد وە کردەوەی ناپەسند بوو ٠

سێیەم : خوا لە قوڕئانی پیرۆزدا ئەفـەرموێت ( أدخلوا آل فِرعَون أشَدَّ العَذاب ) واتە ئالی فیرعەون بخەنە سەخت ترین عەزاب ٠

بەڵام ئاسـییە کە خێزانی فیرعـون بو ناچێتە دوزەح چونکو ئیماندار بو وە بەپەیڕەوی فیرعەونی نەکرد ٠

وە هامان کە لەنەتەوەی فـیرعەون نیـە ئەچێتە

سەخت ترین عەزابچونکو پەیرەوی فیرعەونی کرد.
کەوابێ ئال بەمانای دواکەوتوو پەیرەوی کردەی مرۆیە .

چوارەم : ئێمە هەر وەك فەرمانمان پێ کراوە کە سەلاوات لە ئالی محمد لێ بدەین ، ئەبێ سەلاوات لە ئالی ئیبراهیمیش بدەین .وە کافرەکانی قورەیش کە دوژمنی پێغەمبەر بون گشتیان لە نەتەوەی ئیبراهیمن . کەوابێ ئەگەر ئال بەمانا نەتەوە بێت واتە ئێمە سەلاوات لە ئەبوجەهلو ئەبو لەهە بو ئومەیە ئەدەین ، ئەمەش بەتاڵە .

کەوابێ ئال بەمانا نەتەوە نیە ، بەڵکو بەمانا دواکەوتوو پەیرەوی کردەیە .

پێنجەم : ئەگەر ئال بەمانا نەتەوە بێت کەس نیە کە ئالی محمد بێت.چونکو محمد دوودی خوای لەسەر بێت بێ نەتەوە بوو هیچ منالی نێرینەی نەبوو وە منالی کچ بە منالی مرۆ حیساب نینە لە شەریعەتی ئیسلام ، چونکو بەشبەرو میراتبەر نینە لەمرۆ وە عارەب ئەڵێن .

بنونا بنو أبنائنا وبناتنا

بنوهن ابناء الرجال الاباعد

واتە کوڕی کورمان کورمانە بەڵام کوڕی کچ کوڕی پیاوانی دوور لە ئێمەنە وە کوڕمان نیە .

شەشەم : لە تەحیات‌دا سەلام لە پێغەمبەر ئەکرێت وە لە پیاو چاکان ئەکرێت وە هیچ باسی ئالی تێدا نیە کە وابێ لەسەلەواتیش سەلاوات لە پێغەمبەرو پیاو چاکانە بە گوێرەی سەلام • جا ئال پیاو چاکن وە هەموو موسولمان‌پیاو چاکن هەر کەس بە گوێرەی خۆیو کردەوەی •

حەوتەم : ئایینی ئیسلام بۆیە هاتووە کە خەڵك دوای بیرو بڕواو ئایینی خوا بکەوێت نەك دوای ڕێچەن‌و نەتەوە•وە پێغەمبەر (د•خ) بۆ ئەوە هاتووە کە خۆ هەڵدانەوەی بەڕێچەن و نەتەوە لەناوبیات ، وە ئەوە لە دڵی خەڵکی بچەسپێنێ کە هەموو کەس یەکسانە وە کەس لە کەس گەورەتر نیە • بە کردەوەو چاکە نەبێت •

جا کە پێغەمبەر بۆ ئەوە هاتبێت جارێکی تر ناگەڕێتەوە سەر ئەوە کە نەتەوەیەك زل تر بکات • وە لە نەتەوەکانی تر جیای بکاتەوە وە ڕێزێکی تایبەتی بداتێ وە بڵێ سەلاواتیان لێ بدەن • ئەمە دوورە لە ڕێگەی ئیسلام ، بەڵکو ئەمە دروشمی جوولەکانە کە نەتەوەی ئیسرائیلیان بە گەلێ جیاوازو بەڕێز دانا لای خوا وە پێی ئەڵێن ( شعب الله المختار ) واتە گەلی هەڵبژاردراوی خوا •

جا دروشمی ئیسلام ئەوەیە ( ان اکرمکم عند الله اتقاکم ) واتە کێ پەیرەوی ئایینی زیاترە ئەوە لای خوا بەرزترە وەك حەزرەتیش ئەفەرموێت ( الجنة

لمن اطاعه ولو عبداً حبشيا ) واته بەهەشت بۆ کەسێکە پەیرەوی فەرمانی خوا بکات با بەندەیەکی حەبەشی بێت ٠

( والنار لمن عصاه ولو شريفا قرشيا ) وە دوزەخیش بۆ گوناهبارە با گوناهبارەکەش بە ڕێزێکی قورەیشی بێت ٠

جا براکەم ئەگەر ئەتەوێت لە مانای ئال زیاتر تێ بگەیت‌و بزانیت تەماشای شەرحی موسلیم بکە کە هی ئیمامی نەوەوی‌یە٠وە تەماشای (نیل‌الاوطار) بکە کە هی شەوکانییە ، وە تەماشای تەفسیری قورطوبی بکە ، وە تەماشای ( جلاء الافهام ) بکە کە هی ( ابن القيم الجوزی ) یە ٠ جا باش ئەزانیت کە ئال ئەو کەسانەن کە پەیرەوی پێغەمبەر ئەکەن ٠

ئیتر هەول بدەو چاکە بکە وە پەیرەوی حەزرەتی (محمد) بکە تاکو ببێتە ئالی محمد وە سەلاواتت لەسەر لێ بدرێت ٠

خوایە بمانکەی بە ئالی محمد ـ آمین ـ

## بۆ زانین

حەزرەتی پێغەمبە دروودی خـوای لێ بێـت لە جێگاییێکی تریش باسی ئالی کردووە ٠وەفەرمویەتی [ اللهم اجعل رزق آل محمد كفافاً ] واتە خـوایە رزق‌و روزی ئالی محمـد سـەروبەر بێت ، واتە نە هەژار بن‌و نە دارا بن کە ماڵیان لە پێویستی خۆیان زیدە بێت ٠ جا لێرەشدا مەبەس لە ئالی محمد خۆیو خێزانەکانیـەتی بەس ٠٠ چونـکو ئەگـەر هەموو ئۆممەت بێت نابێت چونکو دوعای پێغەمبەر قەبولە وە زۆر کەسیش لە ئوممەت بوینـە ملیـونێر ٠ وە ئەگەر خـزمی خۆی بێت ئـەوەش نابێت چـونکو ئەوانیش زۆر دەوڵەمـەند بوینـە بەڵام خـۆیو خێزانەکانی روزی سەرو بەریان هـەبو وەزێدەیان نەبو ٠

**تێبینی :**

ئەوەی کە ووتمـان کە سـەلاوات لە سەر ئـال لە تەحیاتی دواییداواجبە یان سوننەتە ٠ ئـەم بڕیارە بەس هی ڕێبـازی ئیمامی شـافیعی‌یە ، وە لـە ڕێبازەکانی تردا نە واجبە وە نە سوننەتە ٠ وە هیچ پێویست نیە کە بوترێت ٠

**بۆ ئاگاداری :**

ووشەکانی تەحیات هەموو بنچینەکانی ئیسلام بیر نوێژکەر ئەخەنەوە ٠ وە ئاگاداری ئەکەنەوە کە

پێویستە موسوڵمان چۆن بێت · چونکو پوختەو ئامانجی ئیسلام چوار شتە · یەکەم دڵسوزی بەرامبەر خوا ، وە دڵسوزی بەرامبەر خوا ئەوەیە کە لە هەموو شت بە گەورە تری بزانی وە بەس ئەو بپەرستی وە پەیرەوی ئەو بکەیت جا ئەمە لە ووشەی ( التحيّات لله )دا نیشان ئەدات · چونکو واتەی ( التحيّات ) ئەوەیە هەموو گەورەیی‌و ڕێز گرتن بۆ خوایەو وە ئەبێ پەیرەوی ئەو بکرێت وە سەر بۆ ئەو دا بنوێنرێت‌و بەس ·

دووەم ئامانج دڵسوزی بەرامبەر پێغەمبەرە ،ەو دڵسۆزی بەرامبەر پێغەمبەر وایە کە خۆشت بوێت وە ولە فەرمانی لانەدەیت · وە ئەوەش لە ووشەی ( السلام عليك أيها النبی ) دەر ئەکەوێت · چونکو کە ئەڵێیت ( السلام عليك ) ·واتە ڕەحمەتی خوات لەسەر بێت · وە ئەمە نیشانەی خۆشەویستنە · وە کە ئەڵێی ( ايها النبی ) واتە پێغەمبەری خوایە وە پێغەمبەر ئەبێ پەیرەوی بکرێت وە لە فەرمانی لانەدرێت سێیەم ئامانج دڵسوزیە بەرامبەر بە هەموو موسوڵمانێك · وە ئەوەش لە ووشەی (السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين )دا دەر ئەکەوێت·چونکو تۆ کە سەلام بۆ خۆت داوا ئەکەیت وە بۆ موسوڵمانانیش داوا ئەکەیت ، ئەمە نیشانەیە کە ئەوەی بۆ خۆت داوا ئەکەیت وە ئەخوازیت بۆ موسوڵمانانیش داوا ئەکەیت ، وەئە خوازی · وە

به هۆی خود بینی ، موسولمانان له بیر نا که‌یت • جا ئه‌وه دڵسوزیه وه په‌یره‌وییه له فه‌رمانی حه‌زره‌ت که ئه‌فه‌رموێت ( لایُؤمن أحَدکُم حَتى یحب لاخیه ما یحبّ لنفسه ) •

وه چواره‌م مه‌به‌س شایه‌تمانی هێنانه • ئه‌وه‌ش له‌دوو ووشه‌ی ( اشهد ••• هتد ) نیشان ئه‌درێت•

جا ئه‌م چوار مه‌به‌سه په‌یوه‌ندییان پێکه‌وه هه‌یه، واته ئه‌گه‌ر له‌م چوار ئامانجه مرۆ یه‌کێکی نه‌بێت به موسولمان حیساب نیه • واته ئه‌گه‌ر که‌سێك دڵسۆزی خوای هه‌یه به‌ڵام هی پێغه‌مبه‌رو موسولمانانی نیه وه شایه‌تمانی نیه ئه‌مه موسولمان نیه • وه ئه‌گه‌ر دڵسۆزی خواو پێغه‌مبه‌ری هه‌یه به‌ڵام هی موسولمانانی نیه وه شایه‌تمانی ناهێنی موسولمان نیه • وه ئه‌گه‌ر دڵسوزی خواو پێغه‌مبه‌ر وموسولمانانی هه‌یه وه شایه‌تمانی ناهێنێ موسولمان نیه • به‌ڵکو موسولمان ئه‌وه‌یه دڵسوزی خواو پێغه‌مبه‌رو موسولمانی هه‌بێت • وه شایه‌تمانیش بێنێت ئه‌وجا موسولمانێکی به‌ڕاستیو بێ درۆیه •

# واتـەی
# ووشەکانی نوێژ

لەناو نوێژدا چەند ووشە هەن پێویستە مانایان بزانیت • جا با مانایان بنووسین بۆ موسولمانان •

یەکەم کە مرۆ نوێژ دا ئە ئەبەستێت ئەلێت ( الله اکبر ) • وە کە بۆ ڕکوع ئەچێت وە کە بۆ سەجدە ئەچێت وە کە لە سەجدە هەلئەستێتەوە وە کە ئەچێتەوە سەجدە وە کە لە سەجدە هەلئەستێتەوە لە گشتیدا ئەلێت ( الله اکبر ) واتە خوا لەهەموو شتێك گەورە ترە کە وابێ •

ئەبێ پەرستنو سەجدە بردنو پەیرەوی بەس بۆ خوا بێت •

دووەم : کە لە ڕکوعدا هەلئەستیتەوە ئەلێی ( سمع الله لمن حمده ) واتە خوا قەبول بکات سوپاسی ئەو کەسە کە سوپاسی ئەکات •

سێیەم : لە ڕکوعدا ئەلێت (سبحان ربی العظیم واتە پاکی بۆ خوای گەورەیە •

چوارەم : لە سەجدەکاندا ئەلێی ( سبحان ربی الاعلی ) واتە پاکی بۆ خوایە کە لە هەموو شت بەرز ترە • وە کە سەلام ئەدەیتەوە ئەلێی ( السلام علیکم ورحمة الله ) واتە سەلامی خواتان لێ بێت ئەو کەسانەی لە ڕاستەی منن لە ئیماندارانو مەلائیکەتان •

وه له دووهم سهلام واته سـهلامتان لیٚ بیٚت ئهی کهسانی له چهپهن له موسولمانانو مهلائیکهتان ٠

جا برا منیش وا سهلامم له نوسینی ئهم نامهیه دایهوه

وه سهلامی خواتان لیٚ بیٚ ههر کهس که نامهکهم ئهخویٚنیٚتهوه ٠

وه له خوام نیـازه که خـوا له هانامان بیٚت لـه سهرهتای ههموو ئیشیٚكو له کوٚتاییـ ـ آمین ـ ٠

تهواو بوو به یارمهتی خوا له ڕوٚژی ٢٠ ڕهجهب ١٤٠٣ کوٚچی وه له ٢/٥/١٩٨٣ له ئوٚدهی مزگهوتی ( حسن البارح ) له بهغدا ٠

خوا ڕهحممان پیٚ بکات ٠ آمین ـ

**محمد شیخ طه بالیسانی**

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم

هەر بە ناوی خوای مەزن دەست پێ ئەکەم
یارمەتیش بەس لەو شەهە داوا ئەکەم
گشت سوپاسم بۆ ئەوە چۆنێك کرا
چون ئەوە خێوی نهێنیو ئاشکرا
هەم دروودو پیتی زۆرو بێ ژمار
بێ لە خزمەت حەزرەتی پەروەردیگار
بۆ ( محمد ) پێشەوای پێغەمبەران
خۆشەویستی خوایی مەزنە بێ گومان
جا ئەڵێت بەندەی هەژارو دڵ بەئاە
شێخ تەها زادە ( محمد ) پڕ گوناە
گیانە قورئان موعجیزەی پێغەمبەرە
هەم لە بۆ ڕێگایی پڕ سوود ڕەهبەرە
گفتوگۆی یەزدانی پاکە بێگومان
ڕاستو چەوتی بەس بەوی ئەکرێ بەیان
خویندنی پڕسوودە هەم بەر کردنی
بۆ مرۆ ئیمرۆکەوو پاش مردنی
خویندنی قورئان چرایە بۆ دڵان
پەیرەوی پڕ سوود ئەکات ڕێگەی ژیان
هەر کەسێ قورئان ئەخوێنی پر بە دڵ
جێگەوو ڕێگەی بەهەشتەو باغی گوڵ
گەر بە چاکی بی خوێنی هەم ڕەوان
دەر بخات گشت پیتەکانی زۆر جوان

خوێندنی تەجوید لە بۆیێ واجبە
بۆ کەسێ بۆ خویندنی قورئان طالیبە
بۆیە زۆر زاناوو دانای پڕ هونەر
ڕوونی کردیە باسی تەجوید پەڕ بە پەڕ
جا بە تورکی‌و فارسی هەم عارەبی
کەم هەبوو کوردی بکاتە مەشرەبی
من لە مە حەیفم ئەهات ئەی یاری خۆم
سا دەمێکە من لە مە حەسرەت ئەخۆم
چونکە نەم دی نامەیێ کوردی زوبان
لێی بە ئاسان فێر ببن گشت کوردەکان
جا بە دڵ ئەم ویست برا کوششیش بکەم
بۆ برایان دەفتەرێ پشکەش بکەم
جا بە هۆنراو هەم بە کوردی کەم بەیان
باسی تەجوید بۆ قوتابی کورد زوبان
جا پەشێوی ئیشو کارم ڕێی نەدا
یەك لە دوو یەك دات‌و بەرگە ڕووی ئەدا
تاکو ئێستا دڵ گەرم بوو لەو مەبەس
بەرگریش نەختێ وەلاچوون وەك مەگەس
جا بە هێزی خوا ئەنووسم چەند پەڕان
ناویشم داناوە وانەی کورد زوبان

**« پێشەکی »**

باسی چەند شتێك ئەکات کە پێش خویندنی قورئان مرۆ پێ هەلئەستێت ·

هەر دەمێ ویستت بخوینی ئەی جەوان
چەند پەرێك یا چەند دێریك زۆر جوان
تۆ لە پێشدا دەست نوویژی هەلکرە
قەت بە بێ دەست نوویژ قورئان مەیگرە
چۆن بە بێ دەست نوێژ دەست دان نگبەتە
گەر لە بەر ئەخوینی دەست نوویژ سوننەتە
بۆ مرۆی لەش پیس ناشێت نە لە بەر
نە لە قورئان خوێندنی هیچ دێرو پەر
ژن لە کاتی حەیزو خوینی پاش منال
خویندنی قورئانی نەدرا هیچ مەجال
روو لە قیبلە دابنیشە ئەی برا
جێگە شت پاك بێ ئیتر وا باشترە
گەر دەمت زۆر پاك بشورێت هەم سیواك
جێ بە جێ کەی زۆر پەسندە ئیانی پاك
هەم پەلەی تێدا مەکە هێمن بە جا
پوختە پیتو گشت ووشەی کە ئاشکرا
بیرو هوشت بێ لە خویندنی ئەی برام
هەم لە فەرمانو ووتەی تۆ بت بێ فام
جا هەمو رۆژێك برا سەد ئایەتان
لای کەمی بخوێنە بۆ رۆنی دلان
گەر بکەی پشتت لە قورئان خوێندنێ
ئەی برادەر رۆژی پاشی مردنێ
جا لە خزمەت خواوە قورئان دێتە رو

هەم شکایەت خـۆی ئەکـاتن زو بـە زو
ئەو منی بیر کردو نەی خویندم خـودا
جـا سەزای بـیر کردنی ئیمـرۆ بـدە
جا هـەتا ئەتـوانی بێ خوینـە بـــرا
رۆژو شـەو چـونکو ئـەوە بـۆ تۆ چـرا

## [ تێ بی نیییك لە ]

باسی اعوذ باللە و بسم اللە خویندن پێش دەست
بە قورئان خویندن کردن ٠

جا اعـوذ سـوننەتە پێـش خوینـدنی
سـالە هەر جیگا بێ دەسـت پێ کـردنی
لێك بسـم اللە لـە پێشـی سـورەتا
واجیبە ئەمـا لـە نـاوەند سـوننەتە
بەس لە سـورەی تـەوبە بسـماللە نیـە
چ لە ناوەنـد چ لـە پێشی هـیچ نییـە

## [ روون کردنەوەێیك ]

بۆ وانە لێ دانـەوەی چەنـد ووشـەیێك کە لە
تەجوید دێنە پێش :ــ

با بە هێزی خـوا بکـەم بـۆت ئاشـکرا
واتەیی چـەند شـت کە لێـرەت دێنـە را
حەرەکـە بۆلـە سـکون واتـە زەنـە
حەرەکە بیـزانـە سێ جـۆری هەنـە

فەتحەوو هەم ضەممە کەسـرە تاجی سەر
کەسرە ژێرەو ضەممە بەر هەم فەتحە سەر
حەرف پیتـە کەلمـە واتـە ووشــە
وەقف وێستان وەصـل لێکـدانی ووشـە
موتەحەرڕیـك واتـە پیتـی بـۆل دار
هەر وەهـا سـاکینە پیتی زەنـە دار
مەددە راکێشـانی پیتـە پیتی سـێن
بیبە گەر پێشی لە ژێر بێـت وەك [ مبـین ]
ئەلفەگەر پیشی لە سەر بێت وەك [ سلام ]
واوە گەر پێشی لە بەر وەك [ قـوا ] تەمام
قەلب پیتێ کـەی بـە پێتێ وەك بـە مـیم
دێی ئەکـەی نون وەك ئەلێی [ من بینهم ]
غوننە واتە دەنگك خـەیە لای ژۆری لووت
وەك لـە [ أنّ ] و ( عمّ )دا مەعـلومە بـۆت
دەغم واتـە پەسـتنی پیتێ لـە پیـت
بێ قەلب یا خـۆ لـە پاشـی قەلب بێـت
بێ قەلـب وەك انّ چونکـو اننـە بـۆ
پاشی قەلبیـش [ عَمّ ] چوـنکو عن م بـو
گیانـە کـەم [ اظهـار ]واتـە ئاشـکرا
کردنی پیتە لـە خـۆندن ئەی بـرا
بەینـی اظهـارو دەغـم اخفایـە وەك
گوم بکەی نـون وەك ئەفەرمـوی من فلك

یێـوو واوی زەنـــەدارن پیتـــی لــین
گەر لەسەر بیت پیتی پێش‌وەك خـوف وبین
پیتی حــەلقیٚ پیتـــی قـــورگن دێنــە دەر
ئەو لە قورگا جا شــەشن بیٚ دەردی ســـەر
هێـــوو هــەمزە عەینـــو غەینن ئـــەی بـــرا
حێـــوو خێنـــە زۆر بە باشـــی وەر گـــرە
خوصصە ضغطن قظ کە حەوت‌پیتن لە دەرز
پیتی ایســتعلا نـــە واتـــە پیتـــی بەرز
قوطبو جـد پێنج پیتە پیتـــی قەلقـــەلەن
چونکو وەك ئەیلیٚ لــە دەمتا دەنگ ئەدەن
قەلقەلە نـــابیٚ مەگـــەر ســـاکین ببێـــت
یەك لە ئـــەو پیتـــانە جـــا دوو جۆر ئەبێـــت
گەر زەنـــەی ئەصـــلیە یە کـــوبری بـــلیٚ
وەر ســـکونی تـــازەگی صـــــوغری بـــلیٚ
قەلقەلەی صوغری بچـــوك وەك ( یقطعـــون )
گەورە کـــوبری وەك لـــە وەقفا بیٚ ســـکون
وەك خـــودا گـــاور ئەخاتـــە نـــاو حـــەریق
ئاییـنـم ئیســـلامە مـــن خـــیر الـــطریق
صادو زایـــو ســـینە مـــیرم ئـــەم ســـێیان
ناویـــان پیتـــی صـــەفیرە بیٚ گومـــــان
چۆن ئەکـــەن فیکـــە لـــە کـــاتی خوێنـــدنا
بۆیـــە پیتـــی فیـــکەیان نـــاو لیٚ نـــرا
جا بە کورتی واتەکـــان دوو پـــات ئەکـــەم
تا بە باشـــی تیٚ بگەی ئـــەی گیانـــە کـــەم

حەڕەکـە بـۆل موتەحـەرریك بۆلــدار
هــەم سـكون زەنــەیە ســاكین زەنــەدار
سا برا فەتحـە ســەرەو ضــەممە بــەرە
كاكە جـا كەسـرەش بە ژێری ناو بــەرە
سەرە دار مەفتــوحو مەضــموم بەرە دار
هــەم بــە مەكســوریش ببێــژە ژێـر دار
ویســتانە وەقفـــو وەصـلە لێكـدان
حەڕف پیتــە كەلیمــەش بە ووشــە بزان
مــەددە ڕاكێشــانە گـۆڕین قەلبــە ســا
گنەیە غوننــە • دەغـم پەسـتینە • جـا
ئاشكرا كردن لــە بۆ ( اظهــار ) بـڵێ
هەم لــە بۆ ئیخفــاش گــوم كـردن بڵێ
پیتی نــەرمن حــەرفی لـینو قەلقـــەلە
پیتی دەنـگ دانــن بـزانە مەسـئەلە
پیتی بەرزن حەڕفی ئیسـتیعلا جـەوان
هــەم صـــەفیرن پیتی فیكـە بێ گومــان
تۆ لــە بـۆ تـەنوین بـڵێ دوو بـۆل وەك
( خالِق ) ( خـلقاً ) ( بأمرٍ ) دون شـــك

« بەندی یەكەم باسی نوونی زەنە دار ئەكات »

تۆ بزانــە نـوونی زەنـدار تـەرزی دوون
یەكەمین هــەر نوونە وێنــەی ( لم یكن )
دووەمین تەنوینە واتــە دوو لــە ســەر
دوو لە ژێرو دوو لــە بەر بــت بێت خەبەر

هەر چی لـەو دوو گەییە پیتی ( یرملون )
ییـوو ڕێـوو میـمو لامو واوو نـوون
تۆ بپەستـە نـوون لـەو پیتـانە دا
جـا گنـەی تێـدا مەکـە بـۆ لامو ڕا
وەك ( فمـن لا من رحیـق ) العشـق ذاق
چۆن ئەکـا بـۆ ڕۆژی وەصـلا اشـنیاق
بەس لـە مَنْ راق مـەکە دەغـم بـرا
سا بوێسـتە نەختێ بەینی نونـو ڕا ·
خۆ لـەواوو ییـوو مـیمو نوونـدا
زۆر بـە باشـی تـۆ گنەی تێـدا بکـە
وەك ( فمـن یسـعی ) ( اذن نوره ) بـدا
( ان وفی ) خـلی ( فمـن مقتی ) نجـا
کاتی کەینـە پیتی بێ سـا بیکە میـم
وەك ( فمن بعد ) لـە گشـت بێ دین بەریم
کاتی گەینـە پیتـی قوڕگـا چاوەکەم
ئاشکرای کـە وەك ئەخـۆنی ( من حَکَمْ )
( من خبـیر ) ( مـن عـلیم ) ( مـن أتـی )
مـن هـوای مـن غـمومی دڵ لەتـە
جا لە گشـت پیتی ترا تۆ گـوم کـە نوون
وەك ( فمـن تاب ) ( فمـن ثاب ) عـەفون
(من جری) هەم (مَن دری) (مَن زادَ) ( من
ساد ) ( من شـاء ) و ( من صـادَ ) و ( من
ضاع ) ( من طـاب ) و ( من ظـل ) و ( من
فاق ) ( من قـال ) و ( من کـالَ ) ئـەمەن

جـا لەبۆ غـەیری دەغـم چۆنێـك ببێ ٠
سا لە لەفظێك ٠ یا لە دوو لەفـظ بێنە جێ
لێك لە بۆ دەغمـا ئەبێ دوو لەفـظ بن
گەر لـە یـەك لەفظـا ببـن بێ دەغـمە بن
وێنەیی ( منـوال ) و ( مُنْیه ) و ( منرجم )
( منلمع ) هـەم ( منمحی ) هەم ( منوشـم )

## ( بەندی دووەم )

لە باسـی ئـەمە کـە لە کـوێ ڕێ بە گـەورە ئەخوینریت وە لە کوێ بە بچوك ئەخوێت ٠

ڕێ لە سەر بوو یـان لە بـەر بوو گەورەیە
گەر لـە ژێر بوو کچـکە یە بـەم جۆرەیـە
وێنـەیی ربیّ لـروحی خالـق
هـەر کـەسێ بـڕوا نەکـاتن مارق
هاتو زەندار بوو بـە گەورەی کـە لە بەر
پیتی پێشی گەر لـە سـەر بێ یا لـە بەر
وێنەی ( مەرجان ) و ( قوڕئان ) ئـەی بـرا
( مـریم )و فورقان ئیتـر بـاش وەر گرە
پیتی پێشی گـەر لـە ژێر بوو کچکـەیە
گـەر لـە ژێر بـوونی بـرا ئەصـلیەیە
وێنـەیی ( فی مـریة ) ( بـل فـریة )
یا لـە ڕۆیـین دا ئـەڵێ فی سـرعة ٠

گەر لـە ژێر بـوونی بەری ئەصـلی نیـە
گەورە یە وەك ( ارجعي ) هەم ( ارِم ) یـە
هاتو ساکین بوو لـە پێشـی صـادو طێ
یـا خـۆ ضـادو خێوو غەینو قافو ظێ
گەورەیە سا پێشـە کەی چۆنێـك هـەبێ
وێنـەیی قرطـاس‌و مرصـاد فرقـە بێ
وێنـەیی فِرقٍ کـە پێشـو پاشـی ڕێ
ژێر دارن هـەر دوو جۆری ڕاسـتە ڕێ(١)

## ( بەندی سێیەم )

باسی لامی ( الله ) ئەکات کە لە کوێ بە گەورە ئەخوینرێت وە لە کوێ بە کچکە ٠

پیتی پێشی گەر لە سـەر بیـت یا لە بـەر
لامی ( الله )گـەورە کە ئـەی تاجی سـەر
وێنـەیی ( وَالله ) ( حـبُ الله ) حـقٌ
گەر لە ژێرە چوکـە وەك ( بالله صـدقُ )

## ( بەندی چووارەم )

## ( باسی نون‌و میمی زەنەدار ئەکات )

میمی زەنـدار گەییـە میم دەغـمی بکـە
هەم لـە گـەڵ دەغما گنـەی تێـدا بکـە
وەك لـکم مـا تعمـلون کـم مـلوك
( هم مضوا ) في النـار من خبـث السـلوك

کاتی گەییە بێ گومی کە هەم گنەی
بیدەرێ وەك ( کم بقی ) بۆ وەصلی خەی

سا لە گشت پیتی ترا زۆر ئاشکرا
بی خووێنە تایبەتی لای واوو فا

وەك ( لهم وصل ) و ( هم فیه ) ئەژین
تا بە کەی من دوور لە کامم دڵ بە خین

هەر دەمێ ئەخوێنی میمی شەددە دار
وێنەیی ( لمّا ) گنەی کە ئاشکار

هەر وەهایە نونی گوشراو(1) ئەی برا
گنەیی تێدایە وەك ( انّی أری )

## ( بەندی پێنجەم )

باسی ئەلفو لامی مەعریفە

ئەلفو لامی مەعریفە وەك ألحَسَن
سا لە گەڵ پیتی دوای دوو حاڵی هەن

چۆن لە طێو تێو صادو ڕێوو تێ
ضادو ذالو نونو دالو سینو ظێ

زێوو شینو لام دەغمە کرێت برا
سا لە گشت پیتی ترا دێت ئاشکرا

جا بە شەمسیە ئەڵێن ناوی یەکەم
قەمەرییەش ناوە چاوم بۆ دووەم ٠

## ( بەندی شەشەم )

باسی لامی ناو ( اسم ) و ( فعلان ) ئەکات
لام ئەگــەر هــاتو لــە ناوانــدا هــەبوو
یا لە ( فعلان ) ســا لــە هەر جێگــایێ بوو
چ لــە ئەووەڵ چ لــە ناوەنــد چ لــە پاش
ئاشــکرا ئەکــرێتو نەیــگۆڕی بــەلاش
وێنەیی ( لقمان ) و ( ســلطان ) افضەلەن
( وآلتقی ) ( قلنا ) و ( قل ) هەم (یـَفعَلـَن)

## ( بەندی حەوتەم )

چوار لقە • لقی یەکەم باسی نیسبەتی پیتەکان لە گەڵ یەك ئەکات •

گشــت پیتێــك ســا لــە گەڵ پیتی تــرا
نیسبەتێك هەس سا لە بەینیــان ئەی برا
جا بە ســێ جــۆران ئەبێت ئەو نیســـبەتە
بۆت ئەبێژم هەر ســێیان لــەم فرســەتە
( متمــائل )واتــە هــــاو وێنــە بــرام
( متقــارب ) لێــك نز یــكن بیکــە فــام
( متجانس ) هــاو ڕەســەن دێتــە زوبان
سا ئەکەم شــەرحی هــەمویان بۆت بەیان
هەر دوو پیتێك یەك بێ وەســفو مەخرەجی
( متمــائل )هــاو وێنـــە دێنـــە جێ
وێنەی دالا لــە گــەڵ دال ســینو ســین
صادو صاد یا ضادو ضاد هەم شــینو شین

( متقـارب واتــه نێـزيك بن لــه يێـك
وەسفو مەخرەجيـان وەكو ڕێو لامـه ڕێك
( متجانس )يێكـه مـەخرەج وەسـف دور
وەك له تێو دال هەم له ثێو ذال دييارە سور

« لقی دووەم باسی حوكمی (متمـاثل) ئەكات كـه گەيشتنه يەك »

دەغمی وێنـه سـا لـه وێنـه واجبـه
پێشـەكەی گەر سـاكينه وەك ( ان نبا )
هـەم وەكـو قـد دخـلوا اذ ذا يجيـك
بـل لنـا وعـد وان نمسـى نفيك
هاتـو پێشی بوڵـدار بـوو ئەی بـرام
مەرجی دەغـمی پێنـجه زۆر باش بيكه فام
يەكـەمين مەرجـه لـه يەك لەفـزا نـه بن
وەك ( شَطَط ) ئيتـر مەيێلـه دەغـم بن
مەرجی دووهەم بەينيان هيـچ پيت نـه بێ
وەك اتـى تنويرنـا عنـد النـبى
سێيەمـين ێيكـەم نەبيتن تێ‌ی زەمـير
ميسـلی ( كنـت تائبا ذنبـى كبـير )
مەرجی چـوارەم يەكەمين گوشـراو نه بێ
وەك يمـس سـهمنا للمطلـب
پێنجەمـين يێكـەم نـه بێ دوو بوڵـدار
وەك لـه ( ملـح حاضر ) ئـەكرێ ديـار

## (لقی سێیەم باسی پیتی متقارب لێك نزیك ئەكات)

لێك نـزیكی بـەس لـە بەینـی لامو ڕێ
هـەم لـە بەیـنی قـافو كافا دێتـە جێ

( بـل رفع قـل ربّ ) بـۆ وێنـە بـڵێ
دەغـم كـە لامـێ لـە ڕێ دا جـێ بـە جێ

هەم الـم نخلقكـم قـاف بیخـە كـاف
دغمی ( بـل ران ) مە كـە تۆ بێ خیـلاف

## « لقی چوارەم باسی حوكمی هاو ڕەسەن ( متجانس ) ئەكات »

( متجـانس )هـاو ڕەسـەن وەك طێو تێ
دەغم لێـك ئەكرێن لە هـەر جێ بێنـە جێ

وەك ( لئـن بسـطت ) ( قالـت طائفـە )
هـەر وەهـا بۆ دالو تێ ( قـد تـلف )

ذالو ظـێ ( اذ ظلمـوا ) بـۆ ثێـوو ذال
سـا لـە ( یلهـث ذلـك )ڕۆنە میسـال

بێ لە میما وەك لـە ( اركـب مّعنـا )
تێ لـە دالا وەك ( أتـت دّعْوتنـا )

هەم بـزانە لـە ( لبثـتّ )ثێ لـە تێ
لایی غـەیری شـێخی حەفصا دەغمـە بێ

## ( بەندی هەشتەم )

باسی مەد ڕاکێشان ئەکات

جا براکەم بۆت بەیان کەم باسی مەد
ڕاکیشانی ووتنی پیت مانایی مەد
دوو بەشە مەد ئەصلیەو هەم فەرعیە
هەر وەها ئەصلیە ناوی تەبعیە
چونکو بێ ئەو نابێ پەیدا پیتی مەد
جا لە بۆت باس کەم کە چەندن پیتی مەد
واو کە زەندار بێت لە پاش پیتی لە بەر
ئەلفێ زەندار بێ لە پاش پیتی لە سەر
یی کەزەندار بێت لە پاش پیتی لە ژێر
میسلی قال قول قیل ئەی دلێر
سا بە ئەندازەی دوو بۆل مەدیان بدە
جا لە مە زیاتر ئیتر مەدیان مەدە
مەددی فەرعی ئەمەتە بێتن بە شوون
پیتی مەددا هەمزە یەك یا خۆ سکون
جا بزانە سێزدە جۆرە چاوەکەم
مەددی واجب ( متصل ) جۆری یەکەم
جائزو هەم ( منفصل ) ناوی دووەم
سێیەمین ( عارض ) بەدەل بۆ چوارەهەم
پینجەمین مەددی عیوەض هەم شەشەمین
لازمی کلمی مثقل تۆ بخوین
لازمی کلمی مخفف هەفتەمین
لازمی حەرفی موشببەع هەشتەمین

لازمــی حــەرفی مخفــف نۆهـــەمە
مــەددی لــین دەهــەم صــلە یازدەهەمــە
دوازدەمینــە مەددی فەرقو ســێزدەمین
مەددی تەمکینـــە بــراکەی زۆر شــرین

## ( متصل ) چۆنه ؟

گەر لە یەك لەفزا بــە شــوێنی پیتی مــەد
هەمــزەیێ بــێ ( متصـــل ) واجبــە مــەد
میســلی ســاء ســوء ســیء بە قــەدەر
پێنــج بۆلان مــەددی پێــدە بێ خــەتەر

## مەددی ( منفصل ) چۆنه ؟

گەر لــە دوو لەفــزا ببــن وەك لا أمیـــل
مەددەکەی ســا جــائزەو هەم ( منفصــل )
جــا لــە حــالی کورجیــا دوو بۆلــە بەس
وەك لە تەرتیل پێنــج بۆل ئەدرێ نــەفەس
بۆ میســال ( یا ایهــا النــاس خــذوا )
( اهــلکم ) هــەم ( وعیـــالی أنقـــذوا )

## مەددی عارض چۆنه ؟

مەددی عــارض وەك بوێســتی ئەی بــرام
تــۆ لــە ئاخــر لــەفز وەك ( نعــم المقــام )
گەر لــە پێشــی پیــتی مەدبێ ئــەی بــرا
وەك ( ثــواب ) یا ( مفلحــون ) (ئامین) خوا

به قەدەر دوو بۆل یــا چــوار مەد ئەکــەی
جائزە باشتر کە شەش بۆل مــەددی کەی

## مەددی بەدەل چۆنە ؟

هەمزە گــەر بێتن لــە پێشـــی پیتی مــەد
وەك لـــە آلو ئـــولو ئیــلو آلأحــد
پێی ئەڵێن مــەددی بــەدەل باش وەر گرە
چۆن هــەلە زۆر نــاپەســندە ئــەی بــرا

## مەددی ( عوض )چۆنە ؟

هەرچی پیتێك دوو لــە ســەر بێ وەك غدا
گەر لە سەر ئەم پیتە وێســتای مەددی دە
واتە دوو ســەر بــە ئەلــف ئەخوێــنی جــا
ئەوەیــە مــەددی ( عــوض ) وەك عوجــا

## مەددی لازمی کلمی مثقل چۆنە ؟

گەر بە شوێنی پیتی مەد بێت شــەددە دار
لازمــی کــلمی مثقــل دێتــە کــار
بە قــەدەر شــەش حەرەکــە مــەددی بــدە
وەك ولا الضــالین وطـــامە وآلنــدا

## مەددی کلمی مخفف چۆنە ؟

مــەددەیی کـــلمی مخفــف وەك چ بــێ
وەك لە پاش مــەددی بەدەل ســاکن هەبێ
وەك لە (آلآن )و لــە ( آلیوم ) دێتە جــێ
بە قەدەر شــەش بۆل ئیتــر مەددی بــدێ

## مەددی لازمی حەرفی ( مشبع ) دوو بەشە :

١ ـ لازمی حەرفی مثقل ٠

٢ ـ لازمی حەرفی مخفف ٠

## لازمی حەرفی مثقل چۆنە ؟

لازمـی حــەرفی مثقـل وەك چ بـێ
وەك لـە ئـەووەل سـورەتا پیتی هـەبێ
خوێنـدنی ئـەو پیتـە سـێ پیتـی ببێ
میسلی صادو قافو لام لێـت گوم نـەبێ
پیتی ئاخـر لـەم سـێ پیتە گـەر کرا
دەغم لـەو پیتـی لـە دوی دێت ئـەی بـرا
میسـلی لام میـم بـە مثقـل نـاو بنێ
گەر نـە بـوو دەغـمی مخـفف نـاوی نێ
میسلی کاف هـا هـەم لـە حامیم دێتـە جێ
هەم لـە یاسـینو لـە قافیـش دێتـە ڕێ
هەم لە صـادو نونو عـەینو غـەینو لام
بە قەدەر شـەش بۆل مـەددی کە تەمـام

## لازمی حەرفی مخفف چۆنە ؟

لازمـــی پیتـی مخفــف وەك چ بـێ
پیتـی ئـەووەل سـورەتا دوو پیـت بێ
وەك لە طاهاو هەم لـە حـامیم ئەی بـرا
بـە قـەدەر دوو بـۆل ئیتـر مـەددی درا

## مەددی صله چۆنە ؟

هێی ضەمیرێ نەر لە بەر بوو یا لە ژێر
گەر لە لەی وەقفەی لە سەر ڕایلێنشە تێر
بە قەدەر دوو حەرەکە وەك ( انّه )
في فراقِ حبّهِ قد لامَهُ
جا بە ئەم مەددە ئەلێن مەددی صلە
تێ بگە شەرطی بە جۆریك موشكلە
شەرتی وایە پێشەکەی زەندار نەبێ
وەك ( علیه ) ( فیه ) ( انسانیه ) نەبێ
بەس حەفص ( فیهِ مُهانا ) مەد ئەكات
جگە لەو هێی پاشی ساكن كورت ئەكات
گەر لە پاش مەددی صلە هەمزە هەبێ
وەك ( لە أمر )ئیتر مەد پترە بێ
بە قەدەر حەوت حەرەکە مەددی بدێ
مەددەیی صیلە درێژی ناو بنێ

## مەددی فەرق چۆنە ؟

مەددەیێکی بۆ تۆ ئیستفهام ئەكا
لە خەبەر جیاواز مەددی فەرقە سا
وەك لە آلآن ولە آللّه دتیەجێ
جا لە چەند جێگا لە قورئان دێتە ڕێ

## مەددی تەمكین چۆنە ؟

مەددی تەمكینە ئەگەر كۆبی دوو یێ
یەكەمین زەندارو خاوەن شەددە بێ

دووەمـین ژێردار بێ وەك بێژی بـرام
لِلنبیّـین الصـلاة والسـلام
هـەم ( وحبیتـم ) بخـیر مـەد کرا
جا دەبا باس کـەین مەخـارج ئـەی بـرا

## ( بەندی نۆهەم )

## باسی ( مخارجی ) پیتەکان ئەکات

مەخـرەجی پیتـان بـە جێگـایێ ئـەڵێن
دەنـگ ئـەداتن کـاتی ئەو پیتـە ئـەڵێن
تا بزانـرێ مـەخرەجی گشـت پیتەکـان
ڕێگـەیی دانـراوە لای گشـت عالمـان
پیتەکەی زەندار بکەو هـەمزەی خە سـەر
وێنـەیی أل یـا خـۆ أم جـا بیخـە دەر
کام جێگـا دەنـگی لێ هـات مـەخرە جـە
قوڕگ یا دەم یـا دوو لێو بیـزانە جـا
حەفدە مەخرج هەن لە بۆ گشـت پیتەکان
سا لە پێنج جیگاوە دێن گشـت حەڤدەکان
یەك هـەوایی دەم دووەم دانو زوبـان
قوڕگو دوو لێو ژووری لوت پێنجەم بزان
یەکـەمین کـانگا هـەوایی نـاو دەمـە
ئەلـفو واوو یێی مـەد گشـتیان لـە مە
مەخرەجی دووهـەم لـە ئاخـر قوڕگـەوە
هـاوو هـەمزە دەر ئـەچن لـەم جێگـەوە

ناوەڕاستی قورکە سێهەم ئەی برا
عەینو حێ لەم جێگە دەرچوون ئاشکرا
مەخرەجی چوارەم لە ئەووەل قورگەوە
غەینو خێ لەم جێگە دێنە دەشتەوە
پێنجەمین ئاخیر زوبان گەر بێ بدەی
لە مەلاشۆی سەر لە بۆ قاف هەوڵەدەی
شەشەمین بۆ کاف ئەویش هەرمیسلی قاف
لێك نەختێ بەروە دەر تر بێ خیلاف
حەوتەمین ناوەند زوبان گەر بێ بدەی
لە مەلاشۆی سەرەوە سێ پیت ئەکەی
جیمو یێوو شین سا لەم جێگە دێن
مەخرەجی هەشتەم ئیتر هەندێ ئەڵێن
ڕۆخی ڕاستە لە زوبانت گەر کەوێ
لە خرێنەی ڕاستە ضاد پەیدا ئەبێ
هەندەکی تر هەر وەکو وانن بەڵام
ئەو لە چەپ پەیدا ئەکەن ضاد ئەی برام
مەخرەجی نۆیەم بدەی نووکی زوبان
لە مەلاشۆی سەرەوەت لام دێتە خووان
دەیەمین وەك لامە بۆ نون بەس ئەبێ
نەختێ بۆ لای قورگ زوبانت نزمە بێ
یازدەمین نەختێ بەرەو خوار تر لە نون
ڕێ لە وێ پەیدا ئەبێت بێ بۆچو چۆن
گەر زوبانت دا لە دانی پێشو گەر
لە مەلا شوش نەختە یێکی بێخە سەر

طێو دالو تێ لەوێ پەیدا ئەبن
هەر سێیان هاو مەخرەجی دووازدەم نەبن
سێزدەمین سێ دانی پێشوو لای سەروو
سەر زوبانت دەی لە بنیان سەر بە خۆ
صادو زێوو سین لە وێ سا دێنە جێ
ئەم سێیە پیتی سەفیر یان ناو بنێ
چواردەمین ئەووەل زوبانت لای سەروو
گەر بدەی لەو سێ ددانی پێشی زوو
ظیوو شینو ذالو دال سا دێنە جێ
لێوی ژێرت دە لە دانی سەر بۆ فی
لێك بدە بۆ بێوو میم سا هەر دوو لێو
هەم لە بۆ واو لێك گوشا کە هەر دوو لێو
حەڤدەمین ( خه یشومه ) واته ژووری لووت
غوننە سا لەو جێگە پەیدا بێ لە بۆت

**( بەندی دەیەمین )**

باسی ( وەقف )وێستان ئەکات
وەقف ئەی جانا بە پێی مانا ئەبێ
جا لە بۆیە چوار بەشی پەیدا ئەبێ
( تامْ ) و (کافی) (حَسَنْ)و ئاخیر (قبیح)
بۆت بەیان کەم پوختو پاکو زۆر فەصیح
هاتوو لەفظێ هیچ نە بوو ڕەبطی دوای
نە بە پشتی ئەو نە بەو وێستە لە لای
وقفی تامە وەك لە ئاخیر ( نستعین )
گەر بوەستی زۆر تەواوەو زۆر شرین

گەر لە مانادا هـەبوو بـەس ڕەبطـەکەی
نەك لــە لــەفزا کافیــە نـاوی وەقفــەکەی
وەك لە سەر ( لایؤمنــون ) تۆوەقفەکـەی
ختم‌اللــە لــەویَ ســـا جیــا ئەکـەی
گەر لە لـەفزا هــاتو ڕەبــطی بوو بــەڵام
بێ ئـەوی پوخـتو پتــەو دەرچـو کـەلام
حەسەنە ئـەو وەقفــە ئەی جـانی شـرین
وەك بوێســتی تۆ لــە ( ربّ العالمـــین )
گەر بکەی وەقفە لــە ســەر لەفزێك بەڵام
هێشــتا نــەبوە کـەلام پوخـتو تەمام
پێی ئەلێن وەقفی قەبیــح هــەر وەك بکەی
تۆ لە سەر ( الحمدُ ) وەقفــە ســا نە کەی

## ( کۆتایی )

سا لە قورئانی شــەریف چەند رەمز هــەن
جا لە بۆ لێــك دانو وێستان نەخشـــە کەن
میـمو طـێوو جیـــمو زێوو صـــادو لا
هــەم صــلی جـا ئاخـرین رەمـزە قـلی
میــم واتـــە لازمـە ویســتانو طێ
واتە وێستان جـووانە لێکدانیش ئەشــێ
جیـمو زێ وصـــاد واتــە وەك یـــەکن
وێســـتانو لێـك دان ئــەی کـاکی من
(لا) مەوێســتە بۆ صــلی واتـــەی تەمـام
هەر دولا هــەن گــەر بڕۆی باشترە بــرام

نه ( قــەلا ) وێســتان باشــتر جــا وەرە
باسی سەکتەت بۆ بکــەم باش وەر گــرە

## ( بەندی یازدەمین )

باسی سەکتە ئەکات

سەکتە وێســتانێکی زۆر ــەم بێ نەفەس
جا لــە چــوار جێگە لە قورئان دیتــە دەس
جا لە سە ەر لامێ لــە ( بل ران ) یــەکەم
نــونی ( مــن راق ) لــە لا اقســــم دووەم
ئەلفی ( مــن مــرقدنای ) یاســین ســێیەم
( عِـو جا )یی کەهفــە چــارەم کیــانەکەم

## ( بەندی دوازدەمین )

باسی سیفاتی پیتەکان ئەکات

جا ســیفاتی پیتەکــان گشــت نۆزدەنــە
وەك لە بۆت ئەکرێ ژمــار بەس هــەندەنە
جەهرو هەمسەوشیددەتەو ڕەخوەو وەسەط
وەصفی (ئیستعلا) وو (استیفال) لە دەست
وەصفی ( اطباق ) ( انفتــاح ) ( اذلاق ) بلێ
وەصفی (اصمات) و (صغیر) و (قــلــقــه ) لێ
وەصفی ( لین ) و ( انحــراف ) تەکریر بلێ
دوای ( تفَشّی ) و ( اســتطاله ) غوننە دێ
لــەو ســیفاتانە گەلێکیــان کــۆ ئــەبن
یەك لە گەڵ یەك هــەندێ تر دژ یەك ئەبن

واته کۆ نابن لـه گەڵ یـەك بۆت ئـەڵێم
چی لـه گەڵ یـەك نابێ کۆ گـوێ بگره لێم
جەهرو هەمســن دژ به یەکتر هــەر وەکو
شیددەتو ڕەخوو وەسـەط قەت نابێ کۆ
پیتی ( اســتعلا ) بـه ( اسـتیفال ) دژه
هەر وەکو ( اصمات ) له گەڵ ( اذلاق ) دژه
( انفتـاح ) دژ بوو به ( اطبـاق ) باقی تر
کـۆ ئـەبن پێکوه لـه پیتێـك یـان پتـر
چونکو باسـی سـیفەتان زۆر موشـکیله
بۆیه وا پێشـکەش ئەکـەم ئەم جـەدوەله
سوودی لێ وەگـره ئیتـر نامـەم تەمـام
زۆور سوپاس بۆ خوا له سەر ئەحمەد سەلام
گەر خودا یار بێت به پەخشـیش دائه نێم
نامەیێـکو گشـت شـتی تێـدا ئەڵێم

## جـەدوەل

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| أ | الجهر | الشدة | الاستفال | الانفتاح | الاصمات | المد | |
| ب | الجهر | الشدة | الاستفال | الانفتاح | الاذلاق | القلقله | |
| ت | الهمس | الشدة | الاستفال | الانفتاح | الاصمات | | |
| ث | الهمس | الرخوة | الاستفال | الانفتاح | الاصمات | | |
| ج | الجهر | الشدة | الاستفال | الانفتاح | الاصمات | القلقلة | |
| ح | الهمس | الرخوة | الاستفال | الانفتاح | الاصمات | | |
| خ | الهمس | الرخوة | الاستعلاء | الانفتاح | الاصمات | | |

د الجهر الشدة الاستفال الانفتاح الاصمات القلقلة

ذ الجهر الرخوة الاستفال الانفتاح الاصمات

ر الجهر التوسط الاستفال الانفتاح الاذلاق الانحراف الكبير

ز الجهر الرخوة الاستفال الانفتاح الاصمات الصفير

س الهمس الرخوة الاستفال الانفتاح الاصمات الصفير

ش الهمس الرخوة الاستفال الانفتاح الاصمات التفشى

ص الهمس الرخوة الاستفال الاطباق الاصمات الصفير

ض الجهر الرخوة الاستعلاء الاطباق الاصمات الاستطالة

ط الجهر الشدة الاستعلاء الاطباق الاصمات القلقلة

ظ الجهر الرخوة الاستعلاء الاطباق الاصمات

ع الجهر التوسط الاستفال الانفتاح الاصمات

غ الجهر الرخوة الاستعلاء الانفتاح الاصمات

ف الهمس الرخوة الاستفال الانفتاح الاذلاق

ق الجهر الشدة الاستعلاء الانفتاح الاصمات القلقلة

ك الهمس الشدة الاستفال الانفتاح الاصمات

ل الجهر التوسط الاستفال الانفتاح الاذلاق الانحراف

م الجهر التوسط الاستفال الانفتاح الاذلاق الغنه

ن الجهر التوسط الاستفال الانفتاح الاذلاق الغنه

و الجهر الرخوة الاستفال الانفتاح الاصمات اللين

هـ الهمس الرخوة الاستفال الانفتاح الاصمات

ى الجهر الرخوة الاستفال الاطباق الاصمات اللين

## ئاموژگاری

ئـەی برای بـە ڕێز گـوێ بگـرە لـە مـن
پەیـرەوی بـکە لـــەو گوفتـارەی مـن
ئەو قورئانـەی کـە خـوا بـۆی ناردینـە
ڕونـاکی دونیــاو ڕونــاکی دیـنە
هــەر کـــەس لێی لادا بێ شــك لەعینـە
جـێی جەهەنـەمەو بەشــی ســۆتێنە
لە پاش قورئانیـش حەدیســی ڕەسـول
جێگــەی بڕوایـەو واجبــە قـەبول
( محمـد ) هەر کـەس لـە فەرمانی ئـەو
لا بــدا ڕێگـەی لێ گــۆڕاوە ئـەو
دەخیل سـەد دەخیـل لـە فـەرمانی خـوا
لـە گـەڵ پێغەمبەر هیـچ مـەبە جـودا
نەوەك ئەنجـامت هــەر دەم زیـا
لـە ڕۆژی سـزاو هــەم لـەم ژیانـە
خوایە پەیوەنـدین نەبڕی لـە گەڵ خـۆت
لان نـە دەی لـە ڕێی پێغەمبـەری خـۆت
ئامـین سـەد ئامـین بـە لوتـفو کـەڕەم
بـە ڕەحـمی خـۆتو حـورمەتی حـەڕەم

به یارمەتی خوا تەواو بوو له شەوی

٢٠/١٠/١٣٩٣ کۆچی

**محمد باليسانی**

## سەر چاوەکانی نامە

١ ـ قورئانی پیروز
٢ ـ تاج الاصول فی احادیث الرسول صلی الله تعالی علیه واله وسلم
٣ ـ مختار الصحاح
٤ ـ تەفسیری ئیمامی رازی
٥ ـ تەفسیری ئیمامی قورطبی
٦ ـ تەفسیر خازن .
٧ ـ تەفسیری نەسەفی
٨ ـ تەفسیری جەلا لەین
٩ ـ جە مەل لە سەر رجە لا لەین
١٠ـ تەفسیری فەرید وە جدی
١١ـ گولستانی شیخی سەعدی
١٢ـ تەفسیری فاتیحە هی شیخ محمدی خال
١٣ـ تەفسیری فاتیحە هی محمد عبده
١٤ـ جلاء الافهام لابن القیم

## كتب المؤلف

# بەر هەمە كانی دانەر

١ ـ بەزوبانی كوردی

١ ـ رولە پەروەری چاپ كراوە
٢ ـ چرای روناكی چاپ كراوە
٣ ـ دەنگی‌دەرون تەفسیری‌سورەتی نون چاپ‌كراوە
٤ ـ باشترین پەند تەفسیری سورەتی الحمـد والە بەر دمتە ٠
٥ ـ وانەی كورد زوبان تەجویدی قورئان والـە بە ردە متە ٠
٦ ـ پر سپـارووەلام لە ئایینی ئیسـلام ئامـادەیە بوچاپ ٠
٧ ـ یادی رابردوم ئامادە كراوە بوچاپ
٨ ـ چون حە ج ئە كەیت ئامادە كراوە
٩ ـ دەنگی ناودلەتەفسیری جزمی‌عەممە ئامادەكراوە بوچاپ ٠

ب ـ بە زوبانی عارەبی

١ ـ كیف تحج وكیف تعتمر چاپ كراوە
٢ ـ القول المنصف تفسیر سورة یوسف جاپ كراوە
٣ ـ القول المتین فی الحلف بغیر الله فی القرآن المبین چاپ كراوە ٠

٤ ــ القول الاغر فيما يلقى على المنبر جاپ نەكراوە
٥ ــ هذا شعرى وهذا شعورى قصـائد دينيه جاپ نەكراوە
٦ ــ اللطف الخفى نظم متن العقائد للنسـفى چـاپ نەكراوە
٧ ــ القول الوفى شرح اللطف الخفى چاپ نەكـراوە
٨ ــ القول المقبول فى بعض معجزات الرسـول صلى الله تعالى عليه واله وسلم چاپ نەكراوە
٩ ــ الاقوال السديده في مسائل مفيده چاپ نەكراوە
١٠ــ القول الجامع فى بعض ما اخـتلف فيه الاحناف والشوافع چاپ نەكراوە
١١ــ تفهيم الامـة تەفسيرى جـزمى عـەحمە چـاپ نەكراو
١٢ــ القول الاسنى فى اسماء الله الحسـنى چـاپ كراوە

جا خوا يارمە تيم بـدات بوچاپ كـردنى چـاب نەكراوەكـان وەبو پێشكەش كردنى چەند نامەى تربوبرامو سلمانەكان ئامين

**محمد باليساني**